بۆ ناساندنی تەواو و بست بە بستی کتێبەکان بە خوێنەرکە یەکێکە لە ئامانجەکانی پێرستی کتێبخانە، پێویستە کە هەر کتێبێك بەشێوەیەکی باش پۆلێن بکرێت ئەو کارەش پێویستی بە ناسینی وردبینانە و تەواوی کتێب هەیە. بە واتایەکی دیکە بۆ ئەوەی کە بتوانرێ پێناسەکانی ئەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت بە باشترین شێوە لەسەر کارتی پێرست یا پێشینەی کتێبناسی (Bibliographic record) چاپ بکرێت، پێویستە بە دیدێکی وردبینانەوە توێژینەوەی لەسەر بکرێت. لە رێگای کارتی پێوستەوە کە خوێنەر دەتوانێ ئەو کتێبەی کە مەبەستییەتی بیدۆزێتەوە بیناسێت. لەم رووەوە، سەرەتاییترین ئەرکی پۆلێنکەر، ئاشنایی لەگەڵ کتێب و هەوڵدان بۆ ناسینی باشتری لایەنە ماددییەکان (فیزیکی) و ناوەرۆکی کتێبە.

بەشێوەیەکی ئاسایی بەشەکانی کتێب و بەها زانیارییەکانی هەریەك لەوانە بەم شێوەی خوارەوەیە:

### ۱- بەرگ (Cover)

بەشی دەرەوەی هەر کتێبێك کە لاپەڕەکانی دەقی کتێبی لە خۆگرتووە و دەیپارێزێت بەرگی کتێبی پێدەگوترێ، زۆرجار بەرگی کتێب لە جۆرێکی قایمتر وەك چەرم، مقەبا، شمیز یا لە مەوادی دیکە دروستدەکرێت و هەندێك جاریش وێنەیەك، کە پەیوەندی بە ناوەڕۆکی کتێبەکەوە هەیە لەسەری چاپدەکرێت.

بەهای کتێبناسی: بەرگ لە راستیدا یەکەمین بەشی کتێبە کە دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەر و لەسەر ئەو بەرگەش پێناسەی تەواوی کتێب کە بۆ خوێنەر پێویستە دەنووسرێت، وەك ناوی کتێب، ناوی نووسەر و هەندێك جاریش زانیاری زۆرتر وەك دەزگای چاپبلاوکردنەوە، ژمارەی بەرگ، هتد....

رووکەشی بەرگ: زانیاری سەبارەت بە نووسەر یا کتێب لەسەری دەنووسرێت، بەلام مەبەستی سەرەکی پڕوپاگەندەیە بۆ کتێب.



پشتی بەرگ: بەشی پێچەوانەی رووی بەرگی پشتی بەرگی پێی دەگوترێ، بەشێك لە زانیارییەکانی کتێبناسی وەك ناو و شوێنی دەزگای بلاوکردنەوە، ژمارەی بەرگ نرخ و بڕێك زانیاری سەبارەت بە نووسەر یا وەرگێڕ لەسەری دەنووسرێت لە زۆربەی شوێنەکاندا، زانیاریە سەرەکییەکانی خودی کتێب وەك ناوی کتێب، ناوی نووسەران و وەرگێڕان بە زمانێکی دیکە ئینگلیزی یا فەرەنسی چاپدەکرێت، کە ئەوانەی کتێب پۆلێن دەکەن دەتوانن کەڵکی لێوەرگرن، هەروەها هۆکارێکە بۆ ناساندنی کتێب بە زمانێکی دیکە لە دەرەوەی سنوورەکاندا.

لەناو بەرگیشدا زانیارییێکی سەبارەت بە نووسەر (یا وەرگێڕ یا بابەتی کتێبەکە دەنووسرێت).

بە تێکڕا کاتێ کە ناوی کتێب لەسەر بەرگ (Cover title) لەگەڵ لاپەڕەی تایبەت بە ناوی کتێب جیاوازییان هەبێت. ئەو ناوەی کە لەسەر بەرگی کتێبەکەوەیە بەشێوەی یادداشتێك لەسەر کارتی پێرست دەنووسرێت.

ئەگەر کتێبەکە لاپەڕەی ناوی کتێبی نەبوو بۆ پۆلێنکردن کەڵك لەو زانیارییانە وەردەگیرێت کە لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسراون.

### ۲- کەعب (Spine)

ئەو بەشە کتێبە کە بەرگ و پشتی بەرگی پێکەوە دەلکێنێت و لاپەڕەکانی کتێب پێوەی دەدوورێن یا دەلکێن کەعبی کتێبی پێدەگوترێ.

بەهای کتێب ناسی زۆرجار لەسەر کەعبی کتێب زانیارییێکی کورت وەك ناوی کتێب یا نووسەر یا وەرگێڕ ناونیشانی دەزگای بلاوکردنەوەی لە هەندێك شوێندا ساڵی بلاوکردنەوە و ژمارەی بەرگ چاپ دەکرێت.

هەندێ جار ناوی کتێبەکە لە کەعبدا نووسراوە لەگەڵ لاپەڕەی ناوونیشانی کتێب جیاوازییان هەیە پێویستە لە کاتی پۆلێنکردندا ئاماژە بەو جیاوازییە بکرێت.

### ٣- لاپەڕە نیوە ناوونیشان (Half-Title page)

هەندێك لە كتێبەكان، لاپەڕەیەك دوای بەرگ و پێش لە لاپەڕەی ناوونیشان هەیە كە لە سەری تەنیا كورتەیەك لە ناوونیشان دەنووسرێت. ئەو لاپەڕەیە بەلاپەڕەی نیوە ناونیشان بەناوبانگە.

بەهای كتێبناسی: تەنیا لە كاتێكدا كە كتێب لاپەڕەی ناوونیشانی نەبوو لە لاپەڕەی نیوە ناوونیشان لە كاتی پۆلێنكردندا كەڵكی لێوەردەگیرێت.

### ٤- لاپەڕەی ناوونیشان (Title page)

ئەو لاپەڕەیەیە كە تێدا زانیارییە سەرەكییەكانی وەك ناوی نووسەر، وەرگێڕ، وێنەكێش، هەڵەچن، پێداچوونەوە، ناوی كتێب، دەزگای بڵاوكردنەوە، ساڵی بڵاوكردنەوە، شوێنی بڵاوكردنەوە، ژمارەی بەرگ و بەشەكانی كتێب تێدا چاپ كراوە. ئەلبەت لە هەموو كتێبەكاندا ناكرێت هەمووی ئەو زانیارییانە لە لاپەڕەی ناوونیشاندا بدۆزرێتەوە، بەڵام بە شێوازێكی گشتی ناوی كتێب و ناوی نووسەرەكان ئەو زانیاریانەن كە لەسەر لاپەڕە و ناوونیشان دەنووسرێن.

بەهای كتێبناسی: بەپێ بنەماكانی پۆلێنكردن، لاپەڕەی ناوونیشان وەكو سەرچاوەیەكی سەرەكی زانیاری (Chief Source of Formation) و پێودانگی كاری پۆلێنكردن حسێب دەكرێت بە واتایەكی دیكە لە پۆلێنكردنی باسیاریدا زانیارییەكانی لاپەڕەی ناوونیشان دەبێ بە هەمان شێوە لە پێشینەی كتێبناسیدا (Bibliographic Record) بنووسرێت، لە هەندێك شوێن كە زانیارییەكانی سەر بەرگی یا كەعبی كتێب لەگەڵ لاپەڕەی ناوونیشان جیاوازییان هەبێت، دەبێ لە شوێنی یادداشتەكان و لەسەر كارتی پۆلێندا ئاماژەی پێبكرێت و لە كۆتایی كارتی پۆلێندا ئاماژە بەو پێناسەیەش بكرێت.



### ٥- ئەودیوی لاپەڕەی ناوونیشان (Verso of Title page)

لاپەڕەیەكە تێدا پێناسەی كتێب (زانیاری وردتر) وەك ناوی كتێب، ناوی نووسەران و وەرگێڕان، ژمارەی بەرگ یا بەشەكان، ناو و ژمارەی زنجیرە. زانیاری دیكەوە وەك ناوی دەزگای بڵاوكردنەوە، چاپخانە، دامەزراوەی پیتچنەكان، نۆبەتی چاپ، تیراژ و زانیاری سەبارەت بە مافی نووسەر، ناوونیشان یان نیشانەی دەزگای بڵاوكردنەوە. سەبارەت بە كتێبە وەرگێڕدراوەكان هەندێكجار زانیاری گشتی كتێب بە زمان و خەتی ئەسڵی دەنووسرێت لە هەندێك شوێندا نموونەی كارتی پۆلێنكردنی پێش لە بڵاوبوونەوە كە بریتییە لە زانیاری تەواو و بەكەڵكی پۆلێنكردن دێت دەنووسرێت.

بەهای كتێبناسی: ئەم لاپەڕەیە، وەك لاپەڕەی ناوونیشان، سەرچاوەی زانیاری بۆ پۆلێنكردنە و هەموو كاتێك دەبێ لەبەرچاوی بگرین، لەبەر ئەوەی كە زانیارییەكانی لاپەڕە ناوونیشان تەواو دەكات.

### ٦- لاپەڕەی دیاری یا پێشكەش (Dedication page)

ئەم لاپەڕەیە لە دوای لاپەڕەی ناوونیشاندایە و رستە یا وتەیەكی نووسەر یا وەرگێڕی لەسەر نووسراوە، كە بەم شێوە بەرهەمی هەوڵ و تێكۆشانی خۆی پێشكەش بە كەسانێكی وەك مامۆستایان، یا كەس و كار و دۆستانی دەكات. ئەم لاپەڕەیە بەهای زانیاری تێدا نییە.

### ٧- پێشەكی وتار (Preface: Foreword)

بەشێك لە كتێب كە لە سەرەتایەوە، دوای لاپەڕەی ناوونیشان و هەندێك جاریش لە پێرستی ناوەرۆكەكان دێت و لەوێدا، نووسەران سەبارەت بە هۆی نووسین و چۆنیەتی بەرهەمەكەیان باسیان كردووە و بەرهەمی خۆیان لەگەڵ بەرهەمە هاوشێوەكانی دیكە بەراورد دەكەن. پێشەكی وتار لەوانەیە لە لایەن كەسێكی دیكەوە بێجگە لە نووسەر (بۆ وێنە وەرگێڕ یا كەسێكی پسپۆڕ و خاوەن را) بنووسرێت.

بەهای کتێبناسی: خوێندنەوەی پێشەکی وتار بۆ باشتر ناسینی کتێبە، بەتایبەت بابەت و ناوەرۆکی کتێب و هەڵبژاردنی ناوی بابەتەکان و ژمارەی ریزبەندی گونجاو، پێویستە. ئەو کتێبانەی کە پێشەکییەکەیان لەلایەن کەسێکی دیکەوە دەنووسرێت بایەخێکی تایبەتی هەیە. وەك نووسەرانی بەناوبانگ، دەبێ لە پێشینەی کتێبەکەدا ئاماژەی پێ بکرێت و لە کۆتایشدا پێناسەیەك بۆ ئەو کەسە زیاد بکرێت. لەوانەشە لە پێشەکیدا زانیاری سەبارەت بە چاپەکانی پێشووتر، یان لەو سەرچاوانەی کە بۆ وەرگێڕان کەڵکی لێوەرگیراوە، هەروەها بەرگەکانی کە لە شوێنێکی دیکەدا ئاماژەی پێنەکراوە باس لێوە بکات.

### ٨- پێرست و ناوەڕۆك یا بابەتەکان (Table of Contents)

لاپەڕەیەك یا چەند لاپەڕەیەك کە دوای پێش وتار و پێش لە پێشەکی دێت کە لەوێدا بابەتە سەرەکییەکان و بەشەکان یا ناوی بەشە سەرەکییەکان بەشێوازێك کە لە دەقی کتێبەکەدا هاتووە دەنووسرێت. پێرستی بابەتەکان هەندێ کات بە وردی دەنووسرێت کە بریتییە لە وردترین ناوونیشانی هەر بەشێك.

بەهای کتێبناسی: پێرستی دەق و بابەتەکان رێنمای ناوەڕۆکی کتێبە وەك: پەنجەرەیەکە بۆچوونەوە نێو دەقەکەوە، لە کاتی پۆلێنکردندا دەبێ پێرستی دەق و بابەتەکان بە وردی شروڤە بکرێن. دەستنیشان کردنی بابەتەکان و هەڵبژاردنی ناوی بابەتەکان بۆ کتێب ئاسانتر بێت.

### ٩- پێشەکی (Introduction)

بەشێك لە سەرەتای دەقی کتێب کە نووسەر بابەتی کتێبەکە شیدەکاتەوە و هزر و بیری خوێنەر بە مەبەستی ئاشنایی لەگەڵ ناوەڕۆك و چوونە نێو بەشی ئەسڵی ئامادە دەکات. لەوانەیە هەندێك جار لە کتێبێکدا وشەی پێشەکی بە هەڵە لەجێی پێش وتار بەکاربهێنرێت.



بەهای کتێبناسی: پێشەکی هەرکتێبێك زۆر زیاتر لە پێش وتار سەبارەت بە ناوەڕۆك و بابەتی کتێب زانیاری بەخوێنەر دەدات، خوێندنەوەی پێشەکی لە لایەن پۆلێنکەرەوە یارمەتی دەدات تا بە وردی و بە تەواوی بابەتەکە بناسێت و ژمارەی ریزبەندی بۆ دیاریبکات، لەوانەیە لە پێشەکیدا زانیاری سەبارەت بە چاپەکان و بەرگەکانی پێشووتر یا داهاتوو دەست بکەوێت.

### ١٠- دەق (Text)

بەشی سەرەکی و بنچینەی کتێب کە باس لە بابەت و ناوەڕۆکی دەکات دەقی پێ دەگوترێت دەق بە هەمان شێواز دێت کە لە پێرستی بابەتەکاندا باسمانکرد. لەوانەیە دەق بەگوێرەی گونجاو بریتی بێت لە رەسم، وێنە، خشتە و لەو بابەتانە. هەروەها لە کۆتایی لاپەڕەکانی دەقدا شیکردنەوە هەبێت (وەك: ژێر نووسەکان، سەرچاوەکان) یا واتای بەرامبەر هەندێك لە وشەکان کە لە دەقدا هاتوون. پێرستی سەرچاوەکانیش لە کۆتایی هەربەشێکدا دێت.

بەهای کتێبناسی: ئامانجی پۆلێنکردن لە راستیدا نیشاندانی ناوەڕۆك و بابەتی دەقی کتێبە بە خوێنەر. لەم رووەوە سەرەڕای خوێندنەوەی پێش وتار و پێشەکی، توێژینەوەی تەواوی دەقی کتێب بۆ هەڵبژاردنی ناوی بابەتەکان و دۆزینەوەی ژمارەی دەستە یا ریزبەندی زەرووره. هەروەها نیشاندانی وردەکارییەکان بۆ وێنە شیکردنەوەی وێنەکان، خشتەکان و سەرچاوەکان لە پێشینەی کتێبناسیدا ( Bibliographic Record) پێویستی بە ورد بینی لە دەقی کتێبدا هەیە.

### ١١- زیادکراوەکان (Appendix)

دوای دەقی کتێب رەنگە بابەتێکی تر بە کتێب زیاد بکرێت وەك خشتەکانی ئامار یا ژمێریاری.

### ١٢- هاوپێچەکان (Supplements)

ئەو بەشەش لە کۆتایی کتێبدا دێت وەك بابەتێکی تەواوکەر لەبەرچاو دەگیرێت هەندێك کاتیش هاوپێچەکان بە شێوازێکی جیاجیا بڵاودەکرێنەوە.

بەهای کتێبناسی: هاوپێچەکان لە دیدی خوێنەرانەوە گرنیگیان هەیە. بەم پێیە هاوپێچە گرنگەکان دەبێ لەسەر کارتی پۆلێندا بنووسرێن تا لەو ڕێگایەوە بتوانرێت بە تەواوی کتێب بۆ خوێنەر بناسرێ.

### پێرستی کۆتایی و ئیندێکسەکان (Bibliographies & Indexes)

بە شێوەی ئاسایی، لە کۆتایی کتێبەکاندا بۆ ئەوەی لە زووترین کات و بە ئاسانی بابەتی دەق و بۆ نیشاندانی برێك زانینی دی چەندین پێریست دروستدەکرێن. کتێبە کۆنەکان ئەم جۆرە پێرستانەیان نەبووە.

### چەشنەکانی ئەو پێرستانە و بەهای کتێبناسییان بەم جۆرەییە:

### ١٣- پێرستی سەرچاوەکان و بنەماکان یا کتێب نامە (Bibliography, References)

لیستی ئەو سەرچاوانەی کە نووسەر لە بەرهەمەکانی خۆیدا کەڵکی لێوەگرتوون یا بۆ خوێندنەوەی زیاتر، ئەوانەی بە خوێنەر ناساندوون لەوانەیە پێرست بە واتاییێکی دیکە مانایێکی جیاواز وەك پێرستی سەرچاوەکان، یادداشتەکان و کتێبناسی لە بەشی پێوەندیداردا هاتبێت، بەهەرحاڵ، ئەگەر کتێب ئەم جۆرە پێرستەی هەبوو دەبێ لە پێشینەی کتێبناسیدا (Bibliographic Record) بنووسرێت. بۆ توێژینەوە لە سەرچاوە ناسێندراوەکان لە پێرستدا دەتوانین زیاتر لە مەبەستی بابەتی کتێب تێبگەین. سەبارەت بە کتێبە وەرگێڕدراوەکانیش زانیاری بەراوردی بڵاوبوونەوەی بەرهەم بە زمانی ئەسڵی و ناوی لاتینی نووسەرەکە بدۆزینەوە لەسەر ئەو ئەساسە، لە سەرچاوەکانی کتێبناسیدا، وەك CD – MRAG دەکرێت بگەڕێن بە دوای زانیاری تەواوی بەرهەمە ئەسڵییەکەدا.



### ١٤- پێرستی وشە و دەستەواژەکان یا فەرهەنگ (Glossary)

لیستی وشە و دەستەواژە تایبەتییەکان کە لە دەقی کتێبدا لەگەڵ بەرامبەرەکەیاندا بە شێوەی ئەلف و بێ لە کۆتایی کتێبدا چاپدەکرێت. لە زۆربەی کتێبەکاندا، دەستەواژە لە زمانێکی دیکەوە بۆ زمانێکی دیکە دروستدەکرێت و مانای وشە گرنگ و دژوارەکان نیشانددات. بۆ زانینی بەرامبەری دەستەواژە گرنگییەکان بە زمانێکی دیکە و دۆزینەوەی ناوی بابەت پێویستە سەیری فەرهەنگی کۆتایی کتێبکە بکەین.

### ١٥- پێرستی ڕێنما یا پێرستی بابەت (Subject or Index)

سیایی، پێرستی بابەت و تایتل گرنگییەکان بە شێوازی ئەلف و بێ کە لە دەقی کتێبدا سەبارەت بە وانە باسکراوی. لەو پێرستەدا لە بەرامبەر هەر بابەتێك، ژمارەی ئەو لاپەڕانە کە پێوەندییان پێوە دیاریکراوە. لە کۆتایی کتێبەکەدا کە سیاسیی بۆ دروستکرا بێت، یارمەتی خوێنەر دەدات لە زووترین کات و بە ئاسانی چکۆلەترین بەشی بابەتی دەقەکە بدۆزێتەوە.

### ١٦- پێرستی دەرخستنی ناوەکان یاسیایی ناوەکان (Proper Noun Index, Norme Index)

پێرستی ئەلف و بێ تایبەتییەکان کە لە دەقی کتێبەکەدا باسیان لێوەکراوە. ناوە تایبەتییەکان بریتین لە ناوی کەسان، شوێن و دیاردە جوگرافییەکان، هۆزەکان، شتومەك و لەو بابەتانە کە هەر کتێبێك لەوانەیە بەپێی ناوەڕۆك هەموو ئەوانەی لەخۆ گرتبێ.

هەروەها لەوانەیە پێرستی دەرخستنی ناوەکان بەشێوەی جیا جیا بەپێی هەر کام لەو خاڵانەی کە ئاماژەی پێکراوە دروستبکرێت. ژمارەی بەرامبەری ئەو ناوانە لە پێرستدا خوێنەر بۆ لاپەڕەی ئاماژەپێکراو لە دەقدا دەنێرێت.

**١٧- پێرستی وێنەکان، خشتەکان و نەخشەکان و هتد.....**

لە کۆتایی هەندێك لە کتێبەکاندا پێرستی وێنەکان و ڕەسمەکان و تابلۆکان و خشتەکان و نەخشەکان کە لە دەقی کتێبدا هاتوون ئامادە دەکرێت تا خوێنەر بە ئاسانی بتوانێ ئەوانە بدۆزێتەوە.

**١٨- پێرستی دەزگای بڵاوکردنەوە:**

لە لاپەڕەکانی کۆتایی هەندێك لە کتێبەکاندا پێرستێك بەرچاو دەکەوێت، کە ناوونیشانی کتێبە بڵاوکراوەکان لە لایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی کتێبەکەوە (وەك کتێبە نوێیەکان یا هەموو بەرهەمەکانی) تێدایە. ئەو پێرستە کە بە پێرستی دەزگای بڵاوکردنەوە ناسراوە لە ڕوانگەی پۆلێنکردنەوە گرنگی نییە.

بەتێکڕا پێرستەکانی کۆتایی کتێب ئەوەی کە لە دیدی خوێنەرەوە گرنگی هەیە، وەك فەرهەنگ و کتێب نامە دەبێ لە پێشینەدا (Bibliographic Record) چاپبکرێت و شێوەی بەرهەمەکە بە تەواوی بە خوێنەر بناسرێت.

هەر پەرتووکخانەیەك کۆمەڵێك کتێب و کەرستەی دیکەی لە خۆگرتووە کە ئەوانەی لەسەر بنەمای ویستی خوێنەران ئامادە و کۆی کردوونەتەوە. ئەو کۆمەڵە کتێبە کاتێك دەکرێت کەڵکیان لێوەربگیردرێت کە خوێنەران و ئەوانەی کە سەردانی کتێبخانە دەکەن بتوانن پێداویستییە زانیارییەکانی خۆیان لە زووترین کات و بە ئاسانی لە نێو ئەو کۆمەڵە کتێبەدا بدۆزنەوە.

لەم رووەوە پێویستە هەموو کتێبخانەکان بەپێی یەکێك لە رێبازە ناسراوەکان، پولێن بکرێن و رێکبخرێن تا ئەو ویست و پێداویستیانە بە چاکترین شێوە دەستە بەربکرێن.

پۆلێنکردن واتا نووسینی تایبەتمەندییەکانی کتێبناسی کتێبەکان بۆ ئامادەکردنی پێرست لەوانە. بە واتاییێکی دیکە پۆلێنکردن بە کۆمەڵێك قۆناغ دەگوترێت کە، بەپێی میتۆدێکی تایبەت، پێناسەی کتێبەکان بۆ دروستکردنی پێرست و کەلکوەرگرتن چ بە شێوەی کتێبی، چ لەئیندیکس و چ لە پێرستەکانی کۆمپیوتەری دەنووسێت.

ئەورۆ پۆلێنکردن بەشێك لە کاری فەننی و توێژینەوەی کارگێڕانەی کتێبخانەکانە بۆ رێکخستنی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە و پێشەیەکی تایبەتی و یاسایی ناسراوە کە پێویستی بە زانستی تایبەت و زانیارییە گشتییەکان هەیە. هەندێك پۆلێنکەر ناچارە سەبارەت بەو کتێبەی کە پۆلێندەکرێت و سەبارەت بە بابەتەکانی توێژینەوە بکات تا جێگای ئەو کتێبە لە نێو کۆمەڵە کتێبەکانی پەرتووکی پەرتووکخانە دیاری بکات لە کایێکەوە و لە جیهانی کتێبناسیدا لە لایەکیترەوە نیشانبدات.



## مێژوو، بنەما و رێساکانی پۆلێنکردن:

### مێژووی پۆلێنکردن:

مێژووی نووسینی یەکەمین پێرستەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی زۆر کۆن، کاتێك کە بۆ دەقەکان و نووسراوەکانی ئایینی، پێرستێکیان وەك لیست دروستدەکرد. ئەلبەت شێوەی کاری رابردوو لەگەڵ شێوازی پۆلێنکردنی ئەمڕۆ بە تەواوی جیاواز بووە و بە پێرست نووسین ناسراوە، بەهەرحاڵ لە رابردوودا نووسین پێناسەکانی کتێب ناسی پەرتووکەکان و نامیلکەکان بە مەبەستێکی تایبەت جێبەجێ دەکرا، کە بەو کارەیان دەگوت پێرستکردن.

لە سەردەمانی رابردوودا ئەو پێرستانە کە بە گشتی لەو کۆمەڵە پەرتووکە و نامیلکانە کە لە کتێبخانەی کەسایەتییەکان، کلێسەکان و کەنیسەکان و کۆشکەکان و لەو جۆرە شوێنانە دروستدەکران بریتی بوون لە لیستێکی سادە لە زانیارییە گرنگییەکان کە پێوەندییان بە کتێبەکانەوە هەبوو و زۆربەیان لەسەر بنەمای ناوونیشان یا شوێنی دانانیان لە پەرتووکی پەرتووکخانە رێکدەخران.

پۆلێنکردن بە چەمکی کۆنییەوە لە هەندێك وڵاتی رۆژهەڵاتی و ئیسلامیدا مێژوویێکی دوور و درێژی هەیە. هەرچەندە زۆربەی پێرستەکان و قایمە کۆنەکان نەماون، بەڵام لەو ژمارە کەمەی کە ماون دەردەکەوێت کە ئەو هونەرە لە نێوان زانایان و پسپۆڕانی هەندێك لە وڵاتان و نەتەوەکان شوێن و پێگەی تایبەتی هەبوو. پێرستی ئیبنی نەدیم ((یەکێکە لە پێرستە بابەتییە سەرەکییەکان و شایانی گرنیگی پێدانە، کە نیشاندەری چۆنیەتی پێرست نووسین و گرنیگی ئەو فەننە لە وڵاتانی ئیسلامیدا.

پێرستەکانی دیکەش کە هەن باس لە گرنگی و سەرنجی کتێب ناسانی دەورانی گەشەکردنی شارستانییەتی ئیسلامە لەمەڕ کتێبخانەکان و پێرستەکاندا. هاوکاتیش، کتێبناسان و شارەزایانی کتێب و کتێبخانە بەداخەوە دەستیان نەداوەتە ئامادەکردن و نووسینی بنەما و رێساکانی پۆلێنکردن و پێرست نووسی.

**بنەماكانی سەرەتایی:**

پۆلێنكردن بە چەمكی نوێوە لەم سەدانەی دواییدا، لە سەدەی پازدە بەم لاوە، داهێنرا و گەشەیسەند و بەردەوام بە هۆی زیادبوونی كتێبەكان و زۆربوونی پێداویستییەكان بەرەو پێشكەوتن رۆشتووە.

پێویستی بە بنەماگەلێك كە بتوانێ لە نووسینی پێرست و نووسینی تایبەتمەندییەكانی كتێبەكاندا كاریگەربن و ببنە هۆی هاوئاهەنگی و یەكدەستی لە نووسینی پێرستەكاندا و بتوانرێت كەڵكی لێوەربگیردرێت. كەم كەم لە لایەن كەسانی جۆراوجۆرەوە لە وڵاتانی ئەوروپا هەستی پێكراوە لەو بارەیەوە هەنگاوی بۆ هەڵگیردرا. لە سەدەی حەڤدەهەمدا بنەماكانی پۆلێنكردن پێشكەوتنێكی زۆرتریان بەخۆوە بینی. كەسانێكی وەك ((جان دیوری)) (Jahn Durie, ١٥٩٥-١٦٨٠) لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەمدا و ((فردريك رۆتگارد)) (Frederik Rostgard) دانیماركی لە سەدەی هەژدەهەمدا لەو بوارەدا بەناوبانگن لە سەدەی هەژدەیەمدا پێرستەكان تا رادەیەك لە شێوازی لیستی ئەو كتێب و نامیلكانەی كە لە پەرتووخانەدا هەیە هاتەدەرەوە و لەوێدا پێناسەی سیانی نووسەر بە تەواوی دەنووسرا و بەكارهێنانی كارتی چاپی و پێناسەكانی لێكدانەوەش بوو بە باو، هەر لەو كاتەدا (١٧٤٧) ئابە روزیە (Abbe Rosier) لە فەڕەنسا، بەكارهێنانی ئیندیكس یا پێرستی كارتی لە كتێبخانەی زانستی زانكۆی پاریس و كتێبخانەی سەڵتەنەتیان دامەزراند. دوای شۆڕشی گەورەی فەڕەنساوە و سپاردنی كتێبخانە تایبەتییەكان و دەسبەسەر داگیراوەكان بە كتێبخانەی میللی (سەلتەنەتی پێشوو) یەكەمین بنەماكانی پۆلێنكردن نووسران. لە بەریتانیا یەكەمین پێرستی مۆزەی بەریتانیا (British Museum) لە ساڵی ١٧٨٧ نووسراون. لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، پێرستی زانكۆی ییل (Yale) یەكێك لە پێرستەكانی سەرەكی و یاسایی حسێبدەكرا. (١٧٩٠).

لە بەریتانیا، لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەهەم باس و وتووێژێكی زۆر سەبارەت بە پێرست نووسی لە ئارادابوو و یەكەمین بنەماكانی پۆلێنكردن لەو كاتەدا



دروستبوو. دوای پەسندكردنی كتێبخانە گشتییەكان لە ساڵی ١٨٥٠ی زایینی، پێرستگەلێكی گرنگ لە كتێبخانە گشتییەكان وەك كتێبخانەی گشتی بیرمنگام (١٨٦٩) و لیڤرپول (١٨٧٥) ئامادەكرا كە لەوەدا پێناسەكان كورت كراوە بوون. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە پێرستەكانی دەستەیی و ئەو پێرستانەی كە بە رادەی پێرستەكانی پێشووتر تەواوتر بوون داهێنرا.

هاوكاتیش پێرستی فەرهەنگی یا واژە نامەیی (Dictionary Catalog) هێشتا نەناسراو بوو، بەڵام پێرستی بابەتی كە چەشنێك كلیل واژە (وەك كلیلێك بۆ دەستنیشانكردنی كتێب لە نووسەرانی هاو ناو) هاوكات بوو، داهێنرا. ((سێر ئانتونی پانیێتسی Sir Anthony Panizzi ١٧٩٧-١٨٧٩)) شارەزای كتێبخانەی مۆزەی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٤١ بنەماكانی ناسراوە بە ٩١ بنەما بۆ دروستكردنی پێرست كتێبێكی بڵاوكردەوە (Nin – one Rules) ئەو بنەمایانە كە نیشاندەری لیستی كتێبخانە بوون و ئامرازێك بوون بۆ دۆزینەوەی كتێب، یەكەمین بنەمای نووسراوە بوون كە لەسەر بنەماكانی دواتر دۆڵ و كاریگەرییان هەبوو. لە ساڵی ١٨٥٣ ((چارلزجوت)) Charles Jewet شارەزای كتێبخانەی ((سمیت سونیان)) (Smithsonien) نووسینی بنەمایێك بۆ بە رێسا دەرهێنانی پێناسە سەرەكییەكانی بابەتی لە پێرستێكدا دەستپێكرد، بنەما سی و یەك دانەییەكانی ناوبراو زۆربەیان لەسەر بنەماكانی ((پانیتسی)) نووسرابوون. (سمیت سونیان)، هەروەها چەندین پێشنیاری بۆ هاوكاری و گرنگیدان بە كاری پۆلێنكردن بە شێوازی ئامادەكردن و نووسینی پێرستی هاوبەش بۆ چەندین كتێبخانەی هێنایە گۆڕێ.

لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پێشكەوتنی بەخێرایی كتێبخانەی كۆنگرە گەشەسەندی چاوەڕوان نەكراوی ئەو كتێبخانەیە، هەروەها پەرەگرتن و گەشەسەندنی كتێبخانەكانی دیكە، گاریگەرییێكی هەنووكەیی لە پێشكەوتن و پێگەیاندنی پۆلێنكردن و نووسینی بنەماكانی پێوەندیدار هەبوو.

له هەمانحاڵشیدا لەگەڵ پەیوەندی زیاتر له نێوان کتێبخانەکان و کارمەندانی شارەزایی کتێبخانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی دیکە بە تایبەت کەنەدا و بەریتانیا، پێویستی بنەماکانی بەرینتر و سەرەکیتر زیاتر له پێش هەستی پێدەکرا.

**بنەماکانی کاتر (١٨٧٦)**

له ساڵی ١٨٧٦ ((چالز ئەمی کاتر Charles Ammi cutter))، کۆمەڵێك بنەمای بۆ پێرستی فەرهەنگی (واژەنامەی) ئامادەکرد کە بریتی بوون له **٣٦٩** دەستوور سەبارەت بە پۆلێنکردنی باسیاری، ناوونیشانە بابەتییەکانی سەرەکی و رێك و پێك کردنی پێناسەکانی کتێب و بنەماکانی کاتر کاریگەرییەکی ئێجگار زۆریان لەسەر دەستوورەکانی دوای خۆی هەبوو. ئەو دەستوورانە بوونە بنەڕەتی پێرستی واژەنامەیی کە له هەموو کتێبخانەکانی گشتی ئەمریکا کاری پێدەکرا.

له بنەماکانی کاتردا، ئامانجەکانی پێرست بریتی بوون له:

**ا- ئاسانکاری بۆ دۆزینەوەی کتێبێك کە یەکێك له پێناسەکانی خوارەوەی تێدابێت:**

١- نووسەر.
٢- ناوی کتێب.
٣- بابەت.

**ب- نیشاندانی ئەو شتانەی کە کتێبخانە هەیەتی. له رێگای:**

٤- نووسەری دیاریکراو.
٥- بابەتی دیاریکراو.
٦- چێوەیەکی دیاریکراو له نووسراو.

**ج- یارمەتیدان بۆ هەڵبژاردنی کتێب له رووی:**

٧- پێداچوونەوەی کتێب (لایەنەکانی کتێب).



٨- تایبەتمەندییەکانی کتێب (ئەدەبی بابەتی)، کاتر شێوازەکانی گەیشتن بەو ئامانجانەی بە لەبەرچاوگرتنی و سازاندنی ئەو خاڵانەی خوارەوە کاراکرد.

ا- شوناسەی نووسەر لەگەڵ سەرچاوەکانی پێویست (بۆ خاڵەکانی ١ و ٤).
ب- شوناسەی ناوونیشان لەگەڵ سەرچاوەکانی پێویست (بۆ خاڵی ٢).
ج- شوناسەی بابەت، سەرچاوەکانی بابەتی (بۆ بەندەکانی ٣ و ٧).
د- شوناسەی فیزیکی و شوناسەی زمانی (بۆ خاڵی ٦).
هـ- دیاریکردنی پێداچوونەوە و چاپ لەگەڵ یادداشتەکانی پێویست (بۆ خاڵی ٧).
و- یادداشتەکان (بۆ خاڵی ٨).

رۆحی ئەو بابەتانەی سەرەوە ئێستاش له بنەماکانی پۆلێنکردنی ((ئەنگلو ئەمریکییەن)) کە ئەمرۆ کاریان پێدەکرێ، جێگایەکی دیاریان هەیە.

**بنەماکانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا (١٩٠٨)**

یەکەمین هەوڵی هاوبەش له نێوان کتێبدارانی ئەمریکایی و بەریتانیا بۆ پەرەپێدانی بنەماکانی پۆلێنکردن له ساڵی ١٩٠٨ بەڕێوەچوو. لەو ساڵەدا بنەماکانی پۆلێنکردن بۆ شوناسەکانی نووسەر و ناوونیشانی کتێب بڵاوکرابوون، له هەمانکاتیشدا بە هۆی ئەوەی کە دوو گرووپی ئەمریکی و بەریتانی له هەندێك له خاڵەکانیدا پێکنەهاتن، دوو دەقی جیا جیای بەریتانی و ئەمریکی ئامادەکران و بڵاوبوونەوە. ئەو بنەمایانە دەرخەری کاریگەری بنەماکانی پێشوو بوون (کتێبخانەی بەریتانی و کاتر و دەستوورەکانی کتێبخانەی کۆنگرە)، بەڵام تا رادەیەکی زۆر له ژێر کاریگەری دەستوورەکانی کاتردا بوو. ئامانجی دەستوورەکانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا، دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی کتێبخانە گەورەکان و زانکۆیی بوو.

**بنەماکانی ڤاتیکان (١٩٢٠)**

دوای ڕێکخستنەوەی دووبارەی کتێبخانەی ڤاتیکان لە ئیتاڵیا، هەندێك لە کتێبدارانی ئەمریکایی و ئەوانەی کە لە لایەن ئەمریکییەکانەوە خولی فیربوونیان دی بوو، بڕیاریاندا تا پێرستێکی تەواو و گشتی لەو کتێبخانەیە ئامادە بکەن بەو مەبەستەش هەندێك دەستووریان نووسی کە تا ڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری دەستوورەکانی ئەمریکاییدا بوون. لەوانەیە کە بگوترێ ئەو دەستوورانە لە کاتی خۆیدا تەواوترین و ڕێکخراوەیترین بنەماکانی پۆلێنکردن لە هەژمار دەهاتن و بریتی بوون لە شوناسەکان، باسیارییەکان، ناوونیشانی بابەتی سەرەکی فایل بەندی لەگەڵ چەند نموونەیەك بوو.

*** پێش نووسی بنەماکانی پۆلێنکردن ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا (١٩٤١)**

دووەمین پێداچوونەوەی بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا لە قەبارەیەکی گەورەتر بە وردی لە ساڵی ١٩٤١ بڵاوکرایەوە. لەو دەستوورانەدا پێویستی بەهاوئاهەنگی و بە ستانداردکردنی پێرستەکان، هەروەها پۆلێنکردنی هاوبەش بەرچاو بوو.

دووبەشی تەواوی ئەو دەستوورانە بریتی بوون لە:

١- ئەو بەشەی کە پێوەندی بە شوناسەکان و بابەتە سەرەکییەکان هەبوو.

٢- ئەو بەشەی کە پێوەندی بە پۆلێنکردنی باسیارییەوە هەبوو. لە هەمان کاتیشدا ئەو پێش نووسە بۆ بابەتە سەرەکییەکان هیچ دەستوورێکی نەبوو.

*** بنەماکانی پۆلێنکردنی باسیاریی کتێبخانەی کۆنگرە (١٩٤٩)**

بە هۆی ڕۆڵێك کە کتێبخانەی کۆنگرە بە ناوی کتێبخانەی ڕابەر و پێشڕەو لە ویلایەتی یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیگێڕا. کەڵکوەرگرتن لە پێرستە چاپییەکانی



ئەو کتێبخانەیە لە لایەك کتێبخانەکانی دیکەوە، زیادیکرد. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە کتێبخانەی کۆنگرە زۆرتر لە ڕابردوو پێویستی بە بڵاوکردنەوەی بنەماکان بێت. لە ساڵی ١٩٤٦ ڕاپۆرتێك سەبارەت بە پۆلێنکردنی باسیاری بڵاوکرایەوە کە لە بنەڕەتدا لەسەر ئەساسی ئەو ئامانجانەی کە (کاتر) ئاماژەی پێکردبوون نووسرا، پێداچوونەوی سەرەتایی ئەو دەستوورانە لە ساڵی ١٩٤٧ و پێداچوونەوەی کۆتایی لە ساڵی ١٩٤٩ بڵاوکرایەوە، ئەو دەستوورانە تەنیا بریتی بوون لە پێرستی باسیاریی و لەوێدا ڕێژەیەکی زۆر لە کەرەستە جۆراجۆرەکانی کتێبخانەوە کە نووسراوە تاقانەییەکان. نەخشەکان لەوحەکان. ئەتڵەسەکان. ئامێرەکانی مۆسیقا، وێنە و ڕەسمە چاپییەکان. کۆپییەکان، میکروفلیمەکان و یەکەمین کتێبە چاپییەکان یا (ئینکونابول) (Incunnabula) لەبەر چاوگیرابوو.

*** بنەماکانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا (١٩٤٩) (A. l. A Rules)**

لەوێڕا کە بنەماکانی پۆلێنکردنی کتێبخانەی کۆنگرە تەنیا بریتی بوو لە پێرستی باسیاریی، ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا بڕیاریدا ئەو بەشە (پۆلێنکردنی باسیاریی) لە کارەکانی خۆی لا بەدرێت و دەستبکات بە دروستکردنی هەندێك دەستوور بۆ دیاریکردنی شوناسەکانی نووسەر و ناوونیشانی کتێبەکان. هەر بۆیە دووهەمین پێداچوونەوەی دەستوورەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٤٩ لە ژێر ناوی (بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنجوومەنی کتێب دارانی بۆ شوناسەکانی نووسەر و ناوونیشانی کتێب بڵاوکردەوە) ئەو دەستوورانە بە شێوازێك نووسرابوون، کە لە پێوەندی لەگەڵ بنەماکانی کتێبخانەی کۆنگرە (١٩٤٩) کە بریتی بوو لە پێرستی باسیاریی کاری پێدەکرا.

تاساڵی ١٩٦٧ کە بنەماکانی پۆلێنکردنی ((ئەنگلو ئەمریکەن)) ئامادە بوو و بڵاوکرایەوە، دەستوورەکانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکی و کتێبخانەی کۆنگرەوە کە بنەماکانی ئیستانداردی پۆلێنکردنی باسیاریی لە هەژمار دەهات.

**کۆنفراسی پاریس**

له ساڵی ۱۹٦۱ ڕووداوێکی گرنگ له پێشکەوتنی بنەماکانی پۆلێنکردن سەریهەڵدا. لەو ساڵەدا کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی سەبارەت بە بنەماکانی پۆلێنکردن له پاریس بەڕێوەچوو، که لەو کۆنفرانسەدا نوێنەرانی یەك وڵاتی جیهانی و دوو ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بەشدارییان کرد. له کۆتایی ئەو کۆنفراسەدا که باس و لێکۆڵینەوەکانی سەرەکی سەبارەت بە بنەماکانی پۆلێنکردن بوو، بەیانییەك که بڵاوکرایەوە که بە ناوی ((بەیانییەی پاریس)) یا ((بنەماکانی پاریس)) بەناوبانگ بوو و تا ڕادەیەکی زۆر له ژێر کاریگەری بنەماکانی سیمور لوبتسکی دابوو. پانتایی ئەو بەیانییەیە تەنیا بۆ هەڵبژاردنی شوناسە و شێوازی ناوونیشانە سەرەکییەکان بوو. بەیانییەی پاریس هەنگاوێکی گەورە بوو له ڕێگا پێکهاتنەکانی نێودەوڵەتی له بواری پۆلێنکردنی باسیارییدا.

یەکێك لەو ئسوڵە گرنگانەی که له کۆنفرانسی پاریسدا شاندی نوێنەرانی هەموو وڵاتان بەشداربوون و لەسەری پێکهاتن، نووسینی کارکردەکانی پێرست بوو Functions of the Catalogue ئەو ئەسڵە که له ڕاستیدا له لایەن لوتسکی و لەسەر بنچینەی کاتر پێشنیارکراو بەم شێوەی خوارەوە بوو:

کارکردەکانی پێریست

پێرستی کتێبخانە دەبێ کاریگەر بێت بۆ ئاگایی ئەو خاڵانەی خوارەوە:

۱- ئایا کتێبخانە کتێبێکی تایبەتی هەیە که ئەو زانیاریانەی خوارەوە لەخۆ گرتبێت؟

أ- ناوی نووسەر و ناوونیشانی کتێب.

ب- ناوونیشان بە تەنیایی (ئەگەر هاتوو ناوی نووسەر و ناوونیشانی کتێب بۆ ناساندنی کتێب گونجاو و بەس نەبێت).

۲-

ا- چ بەرهەمگەلێك له نووسەرێکی تایبەت هەیە؟

ب- چەندین پێداچوونەوە لە بەرهەمێکی تایبەت لە کتێبخانەدا هەیە؟

زۆرینەی بنەماکانی پۆلێنکردن ئێستا لە وڵاتانی جیهاندا لەسەر بنچینەی بنەماکانی پاریس نووسراون و پەرەیان سەندووە.

### بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو – ئەمریکەن (١٩٦٧)

### (Anglo – American Cataloging Rules)

((سیمور لوتبسکی)) سەبارەت بە بنەماکانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا (١٩١٩) رەخنەیەکی توندی لەسەر درێژەکێشان، دووپات بوونەوە، بە لارێدا بردنی هەندێك لە بنەماکان، هەروەك نەبوونی نەزمێکی مەنتیقی دەربری، بەو هۆیەوە ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکی سەرەڕای پێشوازی لە رەخنەکانی بەجێی لوبتسکی، کۆمیتەیەکی مەئمورکرد بۆ توێژینەوە و پێداچوونەوە لە دەستوورەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٥٦ لوبتسکی بۆ خۆی وەك پێداچوونەوەکەرێك ئەو دەستوورەی هەڵبژارد. ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٠ پێش نووسی ((بنەماکانی پۆلێنکردنی بۆ شوناسەکانی نووسەر و ناونیشانی کتێب، بلاوکردەوە و لە پێشەکییەکەیدا ئامانجەکانی پۆلێنکردنی باسکردووە و بنەماکانی لەسەر ئەو ئامانجانەی پەرەپێدا.

لە ساڵی ١٩٦٢ لوبتسکی لە کاری پێداچوونەوەی بنەماکان دەستی هەڵگرت و ((سامنرا سپالدینگ Sumner Spalding)) کارەکەی ئەوی درێژەپێدا. ناوبراو سەرەڕای درێژەدان بە هەمان ئامانجەکان، پێشنیاری هاوکاری نێوان ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا و بەریتانیای هێنایە گۆڕێ. دوای ماوەیەك کە لە دەسپێکردنی ئەو کارە تێپەڕی، بە هۆی رێکەوتنی هەردوو ئەنجوومەن لە هەندێك خاڵدا، بەتایبەت بنەماکانی پێوەندیدار بە شوناسەکانی تنالگانەکان (دامەزراوەکان) بڕیاردرا کۆی دەستوورەکان لە دوو دەقی جیا جیا ئەمریکی و بەریتانی بلاوبکرێتەوە، هەروەها بڕیاردرا کە بنەماکانی لەخۆ بگرێت.



بەهەر شێوە لە ساڵی ١٩٦٧ دەستوورەکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو ئەمریکەن بلاوکرایەوە و چەندین هەڵوێستی جۆراوجۆر سەریهەڵدا. نەزمی مەنتیقی و پێداگرتنی لەسەر رۆڵی نووسەر لە ئیمتیازەکانی ئەو کارە بوون. بەو حاڵەش کارکردنی دوایی ئەو بنەمایانە نیشانیدا کە هەندێك لەوانە نادیار و هەندێکیشیان ناتەواون. بەو مەبەستەش لە ساڵی ١٩٧٣ ئەو دەستوورانەی کە پێوەندییان بە تەنالگانەکانەوە هەبوو پێداچوونەوەیان لەسەر کرا و هەندێك لە خاڵەکانی وەلانران.

### ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاریی کتێبناسی (١٩٤٧)

### (-International Standard Bibliographic Description –ISBD)

دوای کۆنفرانسی پاریس، کەرتی دوایی سەبارەت بە رێکەوتنەکانی نێودەوڵەتی لە کۆبوونەوەی نێودەوڵەتی کارناسانی پۆلێنکردن کە لە ساڵی ١٩٦٩، لە کۆپنهاك بەسترا، لەو کۆبوونەوەیەدا کۆمیتەیەکی تایبەت دەستنیشانکرا بە مەبەستی ئامادەکردن و پەرەپێدانی ئەو ستانداردانەی کە بۆ پێرستی باسیاریی نووسراوە تاکییەکان بەرهەمی کاری ئەو کۆمیتەیە لە ساڵی ١٩٧١ لە ژێر ناوی (ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاری کتێبناسی ( (بۆ نووسراوە تاکییەکان))) بلاوکرایەوە.

لە ساڵی دواییدا، ستانداردە پێشنیارکراوەکان لە لایەن زۆربەی وڵاتانەوە پەسەندکران و لە کتێبناسییە میللییەکانەوە بەکاردەهاتن، بەڵام ئەو دەستوورانەش چەندین خاڵی نادیار و لاواز و بێ شیکردنەوە و وردی تێدابوو، کە لە کۆنفرانسی نێودەوڵەتی ((ئیفلا)) لە گرونویل (١٩٧٣) کەوتە بەرباس، دوای ئەو کۆنفرانسە دوو بلاوکراوەی جیا جیا لە پێداچوونەوەکانی بەریتانی و ئەمریکی بلاوکرایەوە.

*** ئامانجەکانی ئەو چەشنە لە باسیاریی کتێبناسیدا بریتی بوون لە:**

١- ئەو پێشینانەی کە لە وڵاتێك یان لە لایەن کەسانێکی ترەوە و بە زمانێکی دیکە ئامادە دەکرێن بە ئاسانی و بە ساکاری لە وڵاتانی دیکە بۆ کەسانێکیتر بەهەر زمانێك دەرك بکرێت.

۲- پێشینە ئامادەکراوەکان لەهەر وڵاتێك توانای ئەوەیان هەیە لە فایلە جۆراوجۆرەکاندا (پێرستەکان) یا ئەو لیستانەی کە پێشینەکانی وڵاتانی دیکەی لەخۆ گرتوو جێیان بکرێتەوە.

۳- ئەو پێشینانەی کە بە شێوەی نووسراوە یا چاپین، بکرێت بە کەمترین پێداچوونەوە بگۆڕدرێن بەوەی کە ئامێرە ئەلکترۆنییەکان بۆیان بخوێنرێتەوە.

بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە ئاماژەیان پێکرا بە مەبەستی ئەوەی کە زانیارییەکانی کتێبناسی و باسیاریی هەر بەرهەمێك لە وڵاتانی دیکەدا دەرك بکرێن، سەنتەری کۆنترۆڵی کتێبناسی جیهانی ( Universal Bibliographic Control Office –UBC) گەڵاڵەیەکی راگەیاند کە تێدا شێوەی کەلکوەرگرتن لە زنجیرەیەك نیشانەی تایبەت بۆ دیاریکردنی جۆری زانیاری کتێبناسی لە پێرستی باسیاریدا بوو، کە ئەو گەڵاڵەیە لە لایەن زۆربەی وڵاتانەوە پێشوازی لێکراو زۆربەی کتێبناسییە میللییەکان لەسەر بنچینەی نیشانە ستانداردەکانی پێشنیاری ئامادەکران و نووسراون، کارتە چاپکراوەکانی پۆلێنکردن کە لە لایەن کتێبخانەی کۆنگرە و هەندێك دامەزراوەی دیکە ئامادە دەکران و دەفرۆشران لە ستانداردی (I.S.B.D) کەڵکیان وەردەگرت. گرنگترین و بەکەڵکترین ئەو نیشانەی پێرستانەی کە ئێستا هەیە بەناوی نیشانەی پێرستی میللی ئەمریکا (N.U.C) ئەو ستانداردەی بۆ پۆلێنکردنی بەرهەم و کەرستەکانی بەکاردێنێ.

*** بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو – ئەمریکەن، پێداچوونەوەی دووەم (۱۹۷۸)**
**(Anglo – American Cataloging Rules ۲ – AACR ۲)**

کەموکوڕی و هەڵەیەکی زۆر کە لە پێداچوونەوەی یەکەمی بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو – ئەمریکەن (۱۹٦۷)دا هەبوو، بووە هۆکارێك بۆ گۆڕانکاری و پێداچوونەوە لەو بنەمایانەدا.



پێویستی ئێجگار زۆری ستانداردەکانی جیهانی، لاوازیی دەستوورەکانی سەرەتایی باسیاریی کەرەستە غەیرە کتێبەکان، ئینتما بە لابردنی ئەو خاڵانەی کە لە نێو دەقەکانی ئەمریکی و بەریتانی ئەنگلو – ئەمریکەن کێشەیان لەسەر بوو، هەموو ئەوانە دەرخەری ئینتیما بە نووسینی یەك دەستوور بوون، سەرەڕای چاکسازییەکان و زیادییەکان کە لە ماوەی ۱۰ ساڵ لە ئەنگلو – ئەمریکەن ۱۹٦۷ بەکارهاتبوو، پێویستی بە ئامادەکردن و پێداچوونەوەیەکی نوێتری رادەگەیاند.

یەکێك لە خاڵە بنەڕەتییەکان کە دەبێ لەبەرچاو بگیردرێت ئەوەیە کە لە ئامادەکردنی پێداچوونەوەی نوێی بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو-ئەمریکەن بریتی بوو لە کۆنترۆڵی جیهانی کتێبناسی (UBC). ئەو پرۆژەیە لە سی و نۆهەمین کۆبوونەوەی ((ئیفلا)) لە ساڵی ۱۹۷۳ پێشنیارکرا و ئامانجەکەی پێکهێنانی هاوکاری و هاوئاهەنگی زیاتر لە ئاستی جیهانیدا بوو. بیرۆکەی سەرەکی بەم شێوەیە بوو کە هەر کەرەستەیەکی کتێبخانە بێ تەنیا بۆ یەکجار و تا دەکرێت لە لایەن ئەو وڵاتەی کە بەرهەمەکەی بڵاوکردۆتەوە، پۆلێن بکرێت و زانیارییە کتێبناسییەکەی لە هەموو وڵاتدا بە زووترین کات بەردەست بکەوێت و کەڵکی لێ وەربگیردرێت. بە چەشنێك کە لە ئاستی جیهانیدا پەسەند بکرێت.

بەو مەبەستەش، لە ساڵی ۱۹۷٤ ((ئیفلا)) سەنتەرێکی نێودەوڵەتی بۆ کۆنترۆڵی جیهانی کتێبناسی پێکهێنا، هۆی پێشوازی لەو گەڵاڵەیە، زۆربوونی ئینتیما بە هاوکاری و هاوئاهەنگی و بە ستانداردی پۆلێنکردن لە ئاستی جیهانیدا بوو. پێشتر کۆنفرانسی پاریس (۱۹٦۱) و کۆبوونەوەی جیهانی کارناسانی پۆلێنکردن لە کۆپنهاگن (۱۹٦۹) دەرفەتیان بۆ پەرەپێدانی ئەو بیرۆکەیە رەخساند بوو. ساڵی ۱۹۷٤ لە کاتی ئامادەبوون بۆ نووسینی پێداچوونەوەی دووهەمی بنەماکانی ئەنگلو-ئەمریکەن، کۆمیتەیەکی هاوبەش بۆ پێداچوونەوەی ئەو بنەمایانە لەگەڵ بەشداریکردنی نوێنەرانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – کەنەدا و بەریتانیا پێکهات کە یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانیان نووسین و بڵاوکردنەوەی تەنیا یەك دەقی

ئەمریکی و بەریتانی بوو کە سەرەڕای چاکسازی و لەبەرچاو گرتنی زیادکراوەکان سەرنج بدرێتە لایەنە جیهانییەکەی. لەو کۆمیتەیەدا نوێنەرانی ئەنجوومەنی کتێبدارانی ئەمریکا (AIA). کتێبخانەی بەریتانیا (BI)، کۆمیتەی کەنەدایی پۆلێنکردن (CCC). ئەنجوومەنی کتێبدارانی بەریتانیا (LA) و کتێبخانەی کۆنگرە بەشدارییان کرد.

ئەو پرۆژەیە لە ساڵی ١٩٧٥ دەستیپێکرد و لەوێدا بەیانییەی بنەڕەتی پاریس و ستانداردی نێو دەوڵەتی کتێب نامەنووسی (ISBD) بایەخ و گرنگی پێدرا.

لە ساڵی ١٩٧٧ ئەو بنەمایانە بە شێوەی بڵاوکراوەیەکی ئەزموونی بڵاوکرایەوە و بە مەبەستی ئاگاداری و دەربڕینی بیروبۆچوونەکان نێردران بۆ کتێبخانەکانی ئەو وڵاتە، هەروەها بۆ کەسانی شارەزا لەو بوارەدا.

لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩٧٨ پێداچوونەوەی دووهەم بڵاوکرایەوە و کەوتە بەردەست گشتی. پێداچوونەوەی دووهەمی بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو-ئەمریکەن (AACR ٢) بریتی بوو لە دوو بەشی سەرەکی. بەشی یەکەم بنەماکانی باسیاریی جۆرەکانی کەرستەی کتێبخانە (چ بەشێوەی کتێب و چ غەیرە کتێب)ی لە خۆگرتبوو بەشی دووهەم بریتی بوو لە بنەماکانی پێوەندیدار بە دیاریکردنی ناوونیشانی سەرەکی (شوناسەکانی سەرەکی) ناوونیشانەکانی ڕێکەوتەیی و سەرچاوەکان بوون.

*** بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو-ئەمریکەن، پێداچوونەوەی دووهەم (AACR ٢ -R) ١٩٨٨**

دوای تێپەڕبوونی یەک دەیە لە کارکردنی پێداچوونەوەی دووهەم بنەماکانی ئەنگلو-ئەمریکەن (١٩٧٨) هەندێك لە کەم و کورییەکانی کە لە یەك پۆلێنکەرانەوە ئەزموون کرابوون و لە نووسراوەکانی پۆلێنکراندا بڵاوکرابوونەوە، پێداچوونەوەیان لەسەر کرا. ئەو پێداچوونەوەیە بە شێوەیەکی جیا جیا لە ساڵانی ١٩٨٣ و ١٩٨٥ بڵاوکرایەوە. لە ئاکامدا دەقی تەواوی بریتی بوو: لە هەموو پێداچوونەوەکان لەگەڵ



بەشی نۆهەم (فایلەکانی زانیارییە ئەلکترونییەکان) کە پێداچوونەوەیەکی بنەڕەتی لەسەر کرابوو لە ساڵی ١٩٨٨ بڵاوکرایەوە و کەوتە بەردەست پۆلێنکەرانەوە لەگەڵ ئەو پێداچوونەوەشدا. دەقی ١٩٨٨ ئەنگلو-ئەمریکەن لەسەر بنچینەی هەمان دەستوورە بنەڕەتییەکانی پێداچوونەوەی پێشوو نووسراوە جیاوازی ئەو، بەهەمان شێوە کە ئاماژەی پێکرا، پێوەندی بە بەشی نۆهەمەوە هەیە کە بە ((فایلەکانی کۆمپیوتەری)) ناو و ناورۆکەکەی گۆڕدراوە. هەروەها سەبارەت بە نازناوەکان و ناوە جوگرافییەکان و ناوی تەنالگانە غەیرە سەرەکییەکان نۆژەن بوونەتەوە.

لە دەقی ئەنگلۆ-ئەمریکەن ١٩٨٨ هەوڵدەدرێت تاهەموو چەشنەکانی کەرەستەی کتێبخانەیی و ژمارەیەکی زۆر لە زمانەکان دەستوورانێکی یەکپارچە و هاوئاهەنگ رابگەیەنێت. لەم ڕووەوە تایبەتمەندی نێودەوڵەتی بوونی زیاتر لە پێداچوونەوەکانی پێشوە. ئەو بەرهەمە تائێستا وەرگێردراوەتە سەر زۆربەی زمانەکان وەك ئەورووپی، ئیسپانیولی، ئیتالی، پۆرتوگالی، چینی، روسی، ژاپۆنی، سویدی، عەرەبی، فارسی، فەرەنسی، فنلاندی، کوریایی، مالزیایی و نەروێژی.

لە وێرا کە لە کاتی پۆلێنکردندا، هەندێك تایبەتمەندی دێنە پێش کە بنەماکانی ئەنگلو-ئەمریکەن لەوانەیە نەتوانێت وەڵامێکی روونی بۆ ئەوانە هەبێت، کتێبخانەی کۆنگرە بڵاوکراوەیەکی لەژێر ناوی ((ڕاڤەی بنەماکان Library of Congress Rule Interpretation)) بڵاوکردۆتەوە کە بە (LCRI) بەناوبانگە و لە راستیدا تەواوکەری بنەماکانی ئەنگلو-ئەمریکەن حسێب دەکرێت.

بەسەرنج دان بە گوڕانکارییە خێراییەکان لە بواری تەکنەلۆژیای پێرستەکانی کۆمپیوتەری و کاریگەری ئامێرە ئەلیکترۆنییە نوێیەکان، لە ئاکامدا پێویستی بە پێداچوونەوە لە ئەنگلو-ئەمریکەن، چوار وڵاتی دامەزرێنەری ئەو پرۆژەیە یانی ئەمریکا، ئوسترالیا، بەریتانیا و کەنەدا لە ساڵی ١٩٩٧ لە ((کۆنفرانسی نێودەوڵەتی بنەماکانی ئەنگلو-ئەمریکەن و داهاتووی)) دەستبەکاربوون و بڕیاردرا دەقێکی نوێ لەسەر بنچینەی گۆڕانکارییە پێشنیارکراوەکان بڵاوبکرێتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی لە کورتە مێژووی پۆلێنکردنی نوێدا، بنەماکانی سەرەتایی پێشاندەری تێکوشانی تاکە کەسی و بنەماکانی دوایش نیشاندەری هەوڵ و تێکۆشان و هاوکاری و هاوبیری دەستەیی و نێودەوڵەتییە.

**ئامانجەکانی پۆلێنکردن و کارکردەکانی پێرستی کتێبخانە:**

ئامانجی سەرەکی و بنەڕەتی پۆلێنکردن، ڕێکخستنی بەرهەمەکان و کەرستەکان و سەرچاوەکانی کتێبخانەیە تا لەو ڕێگایەوە بتوانرێت ئەو کتێبانەی کە پێویستە لە نێو کۆمەڵە کتێبەکاندا بەخێرایی و بە ئاسانی بدۆزرێتەوە، بە واتایەکی دیکە، ئامانجی پۆلێنکردن ئامادەکردن ڕێکخستنی کۆمەڵە کتێب و کەرستەکانی کتێبخانەیە بۆ کەلکوەرگرتن بە چەشنێك کە بەبوونی کەمترین زانیاری سەبارەت بە کتێب یا بەرهەمێك بتوانرێ بە ئاسانی و بە خێرایی بدۆزێتەوە کەڵکی لێ وەربگیردرێت. بە بڕوای ((مارگارت مان Margaret Mann)) کتێبداری بەناوبانگی ئەمریکی، ((ئامانجی پۆلێنکردن ئەوەیە کە کۆمەڵە کتێبەکان بە چەشنێك سیستەم بدا کە هەر کتێبێك بە ئاسانی بدۆزێتەوە کە بۆ کەلکوەرگرتن وەك سەرچاوە یا بە ئەمانەت دەدرێت، هەروەها یەکێکیتر لە ئامانجەکانی پۆلێنکردن ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر بە مەبەستی لە ئامادەکردنی کتێب، ناوەڕۆکی کتێب و پێوەندی ئەو کتێبە لەگەڵ کتێبەکانی دیکە دایە.

بە شێوەیەکی وردتر، ئامانجی پۆلێنکردن، دروستکردنی پێناسە بۆ کۆمەڵە سەرچاوەکانی کتێبخانە لە کتێب و چەشنەکانی دیکەی سەرچاوە)یە، بە جۆرێك کە چکۆلەترین تایبەتمەندییەکانی کتێب ناسی کە پێویستی خوێنەرانە و دەبێتە هۆی ناساندنی باشتر و تەواوتری بەرهەم لەبەرچاو بگیردرێت. لە هەمانکاتدا، پۆلێنکردنی چەندین ئامانجی ڕوونتر بەو شێوەیە کە لە خوارەوە دێت پێ و شوێن دەکرێ.



- لە کتێبخانەیەکدا چ جۆرە کتێبێك هەن؟
- لە کتێبخانەیەکدا چ کتێبێك لە یەك نووسەر هەیە؟
- لە کتێبخانەیەکدا سەبارەت بە چ بابەتێك کتێب هەیە.
- بابەتی هەر کتێبێك چییە؟
- سەبارەت بە یەك بابەت چ کتێب گەلێك هەیە؟
- لە کتێبێك چ چاپگەلێك یا پێداچوونەوە گەلێك هەیە؟

ئامانجی پۆلێنکردن بەم چەمکەش دەتوانین بەیان بکەین کە هەر کتێبێك بە هەموو تایبەتمەندییە گشتی و ڕواڵەتییەکانییەوە لە نێوان کتێبەکانی دیکەدا قابیلی تەشخیس، تەفکیك بێت و بدۆزرێتەوە ((پێرستی ئیستر Piercy Ester)) ئامانج و ئەرکی پۆلێنکردن نیشاندانی ڕێژەی بوونی کتێبەکانی کتێبخانە دەزانێ و لەو باوەڕەدایە کە ئەو کارە دەبێ بەبێ گوێدان بە ڕادەی زانیاری کە لەوانەیە خوێنەر بێت بەڕێوەبچێت.

- **کارکردەکانی پێرست:**

لە باس و وتووێژەکانی سەبارەت بە کۆنفرانسی پاریس، کارکردەکانی پێرست لە زمان لوبتسکی ئاماژەپێکرا.... بە سەرنجدان بە پەرەسەندنی کەم و زۆری و چۆنیەتی پێرستەکان و پێکهێنانی ڕایلکەیەکی جیهانی و دەستپێڕاگەیشتن بە پێرستەکان لە ڕێگای دوورەوە، کارکردەکانی پێرستی گۆڕانکارییان بە سەرداهاتووە بە مەبەستی توێژینەوەی کارکردە نوێیەکان. ئیفلا شاندێکی لێکۆڵینەوەی کردە بەرپرسی پێداچوونەوە لەو باوەڕەیەوە کە ئەو گرووپە ئاکامی کاری خۆی چەند ساڵەی خۆی ڕاگەیاند و بڵاوی کردەوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەی ئیفلا کارکردەکانی سەرەکی پێرست بریتین لە:

١- دۆزینەوەی بەرهەمەکان، وەك دۆزینەوەی هێماییێکی تایبەت لە بەرهەمێك (To find).

٢- ناسینەوەی بەرهەمەکان، هێماکان و چێوەکانی جۆراوجۆری بەرهەمەکان ( To identify).

٣- هەڵبژاردنی بەرهەمێك و هێماکانی (To select).

٤- دەستپێراگەیشتن بە بەرهەمەکان (To obtain)

لە کاتی پۆلێنکردندا دەبێ سەرنج بدرێتە کارکردە جۆراوجۆرەکانی پێشینەکانی کتێبناسی و پێرستێك کە لە کۆمەڵە پێشینەکاندا پێکدێت. پێشینەی کتێبناسی دەبێ زانیارییەکان و توخمە پێویستەکان بۆ وەدیهێنانی کارکردەکانی سەرەوەی لەخۆگرتبێت.

**چەمك و بایەخی پۆلێنکردن:**

هەروەك ئاماژەپێکرا، پۆلێنکردن بەشێك لە کاری فەننی کتێبخانەیە وبە کارێکی تایبەتی حسێب دەکرێت، کە لە ئاکامدا پێویستی بە رۆشنبیرێکی گشتی و بەرین، زانیارییەکانی کتێبناسی و زانستی تایبەت هەیە.

زۆرجاران ئەو خوێندکارانەی کە ئەم وانەیە تەواودەکەن و ئەو تاقمە لە کتێبدارەکان کە سەرقاڵی پۆلێنکردن دەبن، سەرەتا زانیاریی تەواویان لەسەر نییە و هەمیشە پرسیارگەلێکیان لە مێشکی خۆیاندا هەیە کە لە هەندێك بواردا تا چەندین ساڵ بێ وەڵام دەمێنێتەوە.

بۆ بەدەستدانی چەمکە راستەقینەکانی پۆلێنکردن و گرنگی کاری پۆلێنکردن جێی خۆیەتی لە ((مارگارت مان)) کەسایەتی ناسراوی شارەزایی کتێبخانەکان لەم سەردەمەدا و کەسایەتێك کە لە بواری پۆلێنکردن خاوەنی چەندین بەرهەمی پڕبایەخە. بە شێوەی تەواو بگێڕدرێتەوە کە: خۆشبەختی نەتەنیا لەو رووەوە بەنسیبی پۆلێنکەر دەبێت کە لە جیهانی کتێبەکاندا دەژیت، بەڵکو خوێندنەوە و توێژینەوەی کتێب هەستی خۆشبەختی کتێبدار زۆرتر دەکات. هەر بەو بۆنەیەوە دەرفەتی کەلکوەرگرتن لە زانست و زانستی زانایان کە بەرهەمەکانیان لە کتێبخانەدایە، بۆ



خوێنەران ئامادە دەکات، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی کتێبەکان پێویستی بە تێڕوانینێکی بەرین و بەربڵاو، هەستی مرۆڤ دۆستی، هووتاڵ شێلگیرانە و تێکۆشانی زۆر هەیە.

ئەوە ئەرکی پۆلێنکەرە کە بەرهەمی نووسەرانی هەموو نەتەوەکانی بخوێنێتەوە و هەموو یان ڕێکوپێك بکات. وەها کەسێك یارویاوەڕی ((خزمەتکارانی زانست و هونەرە)) پۆلێنکەر وەك واستەیەك لە نێوان نووسەر و خوێنەر کاردەکات و تێدەکۆشێ لە لایێك لە مەبەستی نووسەر بگات و لە لایێکی دیکەشەوە پێداویستییەکانی خوێنەر وەدلێ بێنێ. پۆلێنکەر دەبێ چۆنیەتی و پێکهاتەی بەرهەمێك بناسێت، هەروەها ئەو بەرهەمە بە خوێنەران بناسێنێت. بەمەبەستی گەیشتن بەو ئامانجە پۆلێنکەر ناچارە لە گەڵ بیرۆکەکان حەز و ئارەزووەکانی خەڵك ئاشنابێت، پێداویستییەکانی خوێنەرانی لەبەرچاو بێت و هەوڵبدات کە دابینکردنی شوێنی کتێبەکان رەوتێکی سادە و سروشتی ببڕی... چەمك و ناسینەوەی پێداویستییەکانی گرووپەکانی خوێنەرانە کە کاری مووتاکی کتێبەکان بۆ پۆلێنکردن و کەلکوەرگرتنی خوێنەرە جۆراوجۆرەکان سەرکەوتووانە دەکات....

**بەرنامە و ڕێباز و ڕێچکەی پۆلێنکردن:**

پۆلێنکردنی کۆمەڵەی کتێبەکان و کەرستەکانی دیکە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی جۆری کتێبخانە و تایبەتمەندییەکانی خوێنەران، سوودێکی وای نییە، هەندێك شت هەیە، کە بۆ وێنەیەك دانە کتێب لە کتێبخانە جۆراوجۆرەکاندا بە شێوەی جۆراوجۆر و لەسەر بنچینەی پێداویستی تایبەتی ئەو کتێبخانەیە پۆلێن دەکرێت. لەم رووەوە لە کاتی پۆلێنکردنی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانەیەکدا، دەبێ سەرنج بدەینە چەندین تێبینی و بە لەبەر چاوگرتنی ئەو خاڵانە دەست بە پۆلێنکردن بکەین.

ئەو تێبینیانە پۆلێنکەر ناچار دەکات بەمووتالا و ئاگاداربوونەوە لە بوار و سنووری بابەتەکانی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە، ناسینی خوێنەران و پێداویستییە تایبەتییەکانیان و تەوەرەکانی پێوەندیدار پێشبین دەکات.

بەشێوەیەکی گشتی تێبینییە بنەڕەتییەکان لە پۆلێنکردن و هەڵبژاردنی ڕێچکە و ڕێبازی بریتین لەو خاڵانەی کە ئاماژەیان پێ دەکەین.

**١- جۆری کتێبخانە:**

هەروەك پێشتر گوتمان، ئاستی کاری پۆلێنکردن، چەشنەکانی زانیاری کتێبناسی کە لە پێشینەدا نووسراون، شێوازی بابەت تەرخانکردن، هەروەها ریزبەندی کتێبەکان پێوەندی بە جۆری کتێبخانەوە هەیە. بۆ وێنە کتێبێك کە لە کتێبخانەیەکی تایبەتی یان زانکۆییدا دەکرێت، لەگەڵ هەمان کتێب کە لە کتێبخانەی گشتی دەبێ پۆلێنبکرێت لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازە، بە واتایەکی دیکە، ڕێژەی زانیارییەکان، ئەزموونەکان و جۆری پێویستی خوێنەران لە کتێبخانەیەکەوە بۆ کتێبخانەیەکی دیکە جیاوازە و ئەوەش لەسەر چۆنیەتی و ئاستی کاری پۆلێنکەر کاریگەری هەیە. نموونەیەکی دیکە:

پۆلێنکردنی کتێبێك کە بابەتەکەی یەکێك لە بەشە تایبەتییەکانی پزیشکییە، لە کتێبخانەیەکی گشتی بە شێوازێکی گشتی و تا رادەیەك سادە پۆلێن دەکرێت لە حاڵێکدا لە کتێبخانەی پزشکی، بە شێوەیەکی وردتر و بە کەڵکوەرگرتن لە ناوونیشانە سەرەکییەکان بابەتی شیاوتر وەك ((ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی پزیشکی)) پۆلێن دەکرێت، (Medical Subject Headings).

**٢- سیستەمی کتێبخانە:**

پۆلێنکردنی کتێبەکان لە ڕوانگەی سیستەمی کتێبخانەشەوە دەتوانێت جیاواز بێت ئەگەر کتێبخانەیەك بە شێوەی مەخزەنی داخراو (قەفەسەی داخراو) بەڕێوەبچێت



و خوێنەران لە ڕێگای ئەندێکسەکان و پێرستی کۆمپیوتەری پێداویستییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن. لەو حاڵەدا زانیارییەکانی کتێبناسی کە لە کارتەکانی پێشنیەدایە بە درێژی و بە وردی باسی لێوە بکرێت. بۆ وێنە ژمارەیەکی زۆرتر لە بابەتەکان بدرێت بە کتێب و بۆ هەر بابەتێك کارتێك دروستبکرێت و بخرێتە ناو ئیندێکسەوە. بەڵام ئەگەر کتێبخانە بەشێوەی مەخزەنی کراوە بەڕێوەبچێت، خوێنەران دەتوانن راستەوخۆ لە قەفەسەکاندا کتێب هەڵبژێرن، لەو حاڵەدا پێرست و زانیارییە نووسراوەکان لە کارتی پێشینەدا دەتوانێ ئەرکی ڕێنوێنی تەواوی خوێنەرانی هەبێت و ئەوان بنێرێتە سەر قەفەسەکانی پێوەندیدار.

لەوێدایە کە خوێنەران دەتوانن کتێبە جۆراوجۆرەکان لە بوارێکی تایبەتدا کە لە قەفەسەکاندا و لە یەك ریزدان بدۆزێتەوە و کتێبی شیاو هەڵبژێرێت و تەنانەت دەرفەتی ئاشنایی لەگەڵ بابەتەکانی دیکە و نوێتری بۆ بڕەخسێت.

وردە وردە کە کەڵکوەرگرتن لە کۆمپیوتەر لە پۆلێنکردندا ئاسایی دەبێت و تۆمارکردن و دۆزینەوەی پێناسەی کتێبەکان لەو ڕێگایەوە جێبەجێ دەکرێت، شێواز و ئاستی پۆلێنکردنیش چێوەیەکی تایبەت بەخۆوە دەگرێت.

**٣- ئەو تواناییەی کە هەیە:**

ئاشکرایە توانایی وەك ژمارەی پۆلێنکەران و ئاستی لێهاتوویی و ئەزموونی ئەوان، ڕێژەی بودجەی کتێبخانە و لە بەردەستدا بوونی کۆمپیوتەر و پرۆگرامە پێویستەکان کاریگەری زۆریان لەسەر بەرنامەڕێژی کتێبخانە بۆ جێبەجێکردنی کاری پۆلێنکردن هەیە.

بە لەبەردەستدا بوونی ئەو جۆرە تواناییانە بەرنامەیەکی ڕێکوپێکتر دەکرێت لەبەرچاو بگیردرێت، بۆ نموونە: بە لەبەر دەست دابوونی کۆمپیوتەر و سوفت وێرد و دیسکی کتێبناسی، دەکرێت بەرنامەیەکی چڕوپڕ بۆ پۆلێنکردن بنووسرێت، ئەگەر ئەو تواناییە لەبەردەستدا نەبێت، بەتایبەت ئەگەر کتێبخانە پۆلێنکەری بە ئەزموونی

نەبێت، پێویستە بە کەڵك وەگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی گرێبەستی پۆلێنکەرانی دیکە، یا بەگرێبەست لەگەڵ کتێبخانەیەکی یاسایی بەرنامەی پۆلێنکردن ڕێکبخرێت.

بەهەرحاڵ، بۆ جێبەجێکردنی هەرچی باشتری پۆلێنکردن و بردنە سەرەوەی ئاستی چۆنیەتی کارەکان، دەبێ بەرنامەیەکی ورد و تەواو کە بەسەرنجدان بە جۆری کتێبخانە و توانایی، هەروەها جۆری خوێنەران و پێداویستییەکانی بێت بنووسرێت.

لە لایێکی دیکەوە سەرنجی زۆر و چاوەڕوانی لەکاری پۆلێنکردن و خشتەکاری تواناییەکان بە ڕادەیەکی زۆر (کارمەندان، کات، خەرج) دەبێتە هۆی هاتنە خوارەوەی ڕێژەی چۆنیەتی خزمەتگوزارییەکانی کتێبخانە، لەم ڕووەوە نابێ پۆلێنکردن وەك ئامانج لە بەرچاو بگیردرێت و لە ئامانجەکانی ڕاستەقینە کە فەلسەفەی بوونی کتێبخانە و کارمەندانی شارەزای کتێبخانەیە دووربکەوینەوە.

مەخابن لەگەڵ بوونی هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆری پۆلێنکەران لە ئامادەکردن و ڕێکخستنی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە هێشتا بەشێکی زۆر لە کتێبەکانی کتێبخانەکان پۆلێن نەکراون و ئەو کتێبانە ناکەونە بەردەست خوێنەرانیانەوە. هۆی سەرەکی ئەو کارەش بێجگە لە نەبوون و کەم بوونی پۆلێنکەرانی شارەزا و توانایی پێویست. نەبوونی ڕێباز و بەرنامەی دروست لەو بوارەدا نییە.

**سەرچاوەکان و کەرستەکانی پۆلێنکردن:**

بە مەبەستی جێبەجێکردنی تەواو و دروستی پۆلێنکردن، پێویستیمان بە سەرچاوەکان و کەرستەکانی جۆراوجۆر کە هەرکامیان لە قۆناغێکی کارکردندا کەڵکی لێوەردەگیردرێت. بەبێ لەبەر دەستدا بوونی ئەو جۆرە سەرچاوانە ناکرێت کاری پۆلێنکردن بەشێوەیەکی ورد و تەواو جێبەجێ بکرێت، ئامادەکردن و کۆکردنەوەی سەرچاوە و کەرستە جۆراوجۆرەکانی پێویست بۆ بەشی پۆلێنکردن، یەکەمین ئەرکی بەرپرس لەو بوارەدایە، سەردانی جاروباری لە بەشەکانی پۆلێنکردنی کتێبخانە گەورەکان و ئاشنایی لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی کە کەڵکیان لێوەردەگیردرێت



و لەوانەیە هەندێکیان دەستەبەربکرێن لە دەوڵەمەندکردنی ئەو بەشە کاریگەری هەیە. سەرەڕای ئەوانەش خوێندنەوەی کتێبە تایبەتییەکان لە بواری پۆلێنکردن و هەڵگرتنی لیستی سەرچاوەکانی و کەرستە ئاماژە پێکراوەکان لەوانەشدا ڕێگاییەکە بۆ ئاشنایی لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا.

بە هەرحاڵ، دوای ئامادەکردنی سەرچاوەکان پێویست دەبێ پێشەکییەکانیان بە وردی بخوێنرێتەوە تا پانتایی و شێوەی تەنزیم و شێوازی کەلکوەرگرتن لە هەرکامیان بەشێوەیەکی گشتی تایبەتمەندییەکانی هەر کام بزانرێت.

چەشنەکانی سەرچاوە و کەرستەی پێویست لە بەشی پۆلێنکردندا بریتین لە:

**١- لیستی کتێبە پۆلێنکراوەکان و ((کتێبە پۆلێنکراوەکان لە کتێبخانەکانی دیکەدا)):**

تامەوەیەك لەمەو پێش، ئەو جۆرە سەرچاوەیە بە هۆی ئەوەی کە نموونەی کاری پێڕستەکانی لەخۆگرتبوو، لە پۆلێنکردندا کەڵکی زۆری لێوەردەگیرا و تا ڕادەیەکی زۆر بووە هۆی خێرایی و ئاسانکاری لەو بوارەدا. لەو حاڵەشدا، بەشی پۆلێنکردن دەبێ کۆمەڵەیەکی تەاو لەو جۆرە سەرچاوانە (بە زمانە جۆراوجۆرەکان) کە ناونیشانی جۆراوجۆر و لە ماوەی بڵاوکردنەوەی جیاوازدا بڵاودەبنەوە کۆبکاتەوە. گرنگترین جۆرەکانی ئەوانە بریتین لە:

١- لیستی کتێبە پۆلێنکراوەکان لە ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی کتێبداری (پێشوو).

٢- لیستی کتێبە پۆلێنکراوەکان لە کتێبخانە یاسایی و گەورەکاندا وەك: کتێبخانەی ناوەندی زانکۆکان.

لە گرنگترین کتێبە پۆلێنکراوەکانی بەریتانیاش دەتوانین ((کتێبە پۆلێنکراوەکانی میللی ئەمریکا (NUC) ناوبەرین کە هەموو زمانەکانی لەخۆگرتووە و جێگای متمانەی تایبەتە ئەو سەرچاوەیە لە ساڵی ١٩٩٧ بە دواوە بە شێوەی میکرۆفیش و

شریتی مغناتیسی لە دەیەی. ۱۹۹۰ (تا ساڵی ۱۹۹۷) بەچێوەی دیسك ( CD – Room) ئامادەکراوە و ئەو تواناییەی کە هەیە کە لە ڕێگای نووسەر، ناوونیشان، بابەت، نۆبەتی چاپ و چەند شوناسێکی دیکەوە دەکرێت بە دوای کتێبەکاندا بگەڕێن. لە تواناییەکانی دیکەی ئەو سەرچاوەیە کە دەتوانین پێشینە دۆزراوەکان ڕاستەوخۆ بگوێزینەوە بۆ کۆمپیوتەری کتێبخانە و کاری پۆلێنکردن خێراتر بکەین. دوای ساڵی ۱۹۹۸ سەنتەری CD – MARC تەنیا لە ڕێگای پێوەندی بەردەوام و رایلکەی ئینتەرنێتیٚ کەڵکی لێوەردەگیردرێت. گەڕان و گوازتنەوەی ریکۆردەکان.

### ۲- کتێبناسییەکان و پێڕستەکان:

گرنگترین کتێب ناسی فارسی کە ئێستا بوونی هەیە لە هەر کتێبخانەیەکدا، بەتایبەت لە بەشی پۆلێنکردندا پێویستە، کتێبناسی میللی ئێرانە کە لە ساڵی ۱۹۸٤ بە دواوە بەشێوازێکی نوێ و بەرامبەر لەگەڵ ستانداردەکانی نێودەوڵەتی و لەسەر ئەساسی ئای. ئێس. بی. دی. (ISBD) ئامادەکراو بلاوەکرێتەوە. دەورەی تەواوی ئەو بەرهەمە بەشێوەی (CD – RAM)یش لەبەردەست دایە و کەڵکی لێوەردەگرن پێشنیار دەکەین کە دەبێ بۆ کتێبخانە بکڕدرێت. لە کتێبناسییە بەناوبگەکانی دیکە دەتوانین ((پێرستی کتێبە چاپییەکانی فارسی خان بابامەشار))، ((کتێبناسی بابەتی ئێران)) بەرهەمی حوسەینی بەنی ئادەم، ((کتێبناسی دە ساڵەی)) ئیرەجی ئەفشار و کتێبناسییەکانی گشتی ناوبەرین. پێرستەکانی گشتی غەیرە فارسی، کە بوونیان لە بەشی پۆلێنکردندا پێویستە، بریتن لە (( Books in print)) کە هەموو ساڵێك لە سێ بەشی نووسەر، ناوونیشان و بابەتی پێناسەکانی کتێبە ئینگلیزییەکان کە لە بازاڕدا هەیە ئامادە دەکات. ئەو سەرچاوەیە بە زمانی ئەڵمانی (verzcichnis lieferbarer buche) کتێبە ئەڵمانییەکان کە لە بازاڕ دان، هەروەها بە زمانی فەڕەنسی (les livces disponsibles) کتێبە



فەرەنسییەکان کە لە بازاڕدان لەخۆ دەگرێت. جۆری ئەلکترۆنی ئەو سەرچاوانە بە شێوەی (CD – RAM) و هەروەها (لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە) لە بەردەستدایە.

### ۳- پێرستەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی:

لە بەشی پۆلێنکردن بوونی ((ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسی، ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە (L.C subject Heading) یا ((ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی سیرز)) (Sears list of subject Heading)، بەپێی پێویستی کتێبخانە دەبێ ئامادە بکرێت، کتێبخانەکانی زانستی پزیشکی دەتوانن لە ((ناوونیشانە سەرەکییەکان بابەتی پزیشکی ( medical subject Heading) کەڵکوەرگرن. بەهەرحاڵ خوێندنەوەی پێشەکی ئەو سەرچاوانە بە مەبەستی ئاشنایی لەگەڵیاندا و کەلکوەرگرتنی کاراتر گرنگی تایبەتی هەیە.

### ٤- پێرستە بەڵگەدارەکانی بە ناوبانگان، نووسەران و ڕێکخراوەکان:

لەو سەرچاوانە بۆ هەڵبژاردن و نووسینی شێوەی دروستی ناوەکان (چ لە کاتێکدا کە دەبنە سەر شوناس و چ لە چێوەی شوناسەی زیادکراو) هەروەهاش یەکدەست و هاوئاهەنگکردنی شوناسەکانی ناوەکان و ئامادەکردنی سەرچاوەکانی پێویست، کەڵك وەردەگیردرێت، ((پێرستی ناوی بەناوبانگەکان و نووسەران)) و هاوپێچەکانی و ((پێرستی بەڵگەداری ناوی دامەزراوەکان و ڕێکخراوەکانی دەوڵەتی ئێران)) لەو سەرچاوە پێویستانەیە لە پۆلێنکردندا.

### ٥- گەڵاڵەکانی ریزبەندی:

ئەو سەرچاوانە بۆ ریزبەندی و هەڵبژاردنی ژمارەی ڕێنوێنی کتێبەکان بەکاردێت. هەر کتێبخانەیەکە بەپێی پێویست، یەکێك لە گەڵاڵەکانی ریزبەندی ئاسایی هەڵدەبژێرێت و سەرچاوەکانی پێویست کۆدەکاتەوە گەڵاڵەکانی ریزبەندی کتێبخانەی

کۆنگرە (L.C. Classification schedules) ریزبەندی دەدەیی دیویی: (Dewey Decimal classification)، وەرگێڕدراوی ئەو ریزبەندییە و گەلاڵەکانی دیکە دەبێ ئامادە بکرێن و بخرێنە بەردەست پۆلێنکەرانەوە.

### ٦- خشتەکانی نیشانەی نووسەر:

لەو سەرچاوانە بۆ هێنانەکایەی جیاوازی لە ژمارەی رێنمای کتێب نێوان نووسەرانی بەرهەمە هاوشێوەکان کەڵکوەردەگیردرێت. بەواتاییەکی دیکە. دوای هەڵبژاردنی ریزبەندی شیاو بۆ کتێبەکانی بەو ژمارە نیشانەیەك لە نووسەر و ناوونیشانی کتێب زیاد دەکرێت تا بەتێکڕا ژمارەی رێنمای کتێب وەدی بێت و بەو شێوە بتوانرێ کتێبێك لە نێوان کتێبە هاوشێوەکانی دیکە بدۆزرێتەوە. ((نیشانەی نووسەری فارسی)) (خشتەی سێ رەقەمی) و ((رێنمای بنەماکانی کاتر. سن برن سەبارەت بە نیشانەی نووسەر)) یەکێك لەو سەرچاوانەیە.

### ٧- سەرچاوەکانی دیکە:

سەرەڕای سەرچاوەکانی ئاماژە پێکراو پێویستە چەندین سەرچاوەی دیکە وەك چەشنەکانی کتێبناسی بابەتی، ئینسکلۆپیدییەکان، فەرهەنگەکان، ژیاننامەکان و لەو بابەتانە لەبەردەستدا بێت، لەبەر ئەوەی لە کاتی پۆلێنکردندا تەوەرەی زۆر پێش دێت کە بۆ گەڕان و بەدەستهێنانی زانیاری زۆرتر و تەواوتر، پێویستیمان بەسەرچاوە هەیە.

### تەوەرەکان و گیروگرفتەکانی پۆلێنکردن لە ئێراندا:

پۆلێنکردن بە شێوەی نوێ و بەکەلکوەرگرتن لە بنەماکانی نێودەوڵەتی و رێنووسە یاساییەکان، لە ئێراندا مێژوویێکی چل ساڵەی هەیە. هەندێك لە کتێبخانەکان هێشتا لە شێوازی کۆنی پێرست نووسی کەڵك وەردەگرن و بەشێکی زۆر لە کتێبەکان بەتایبەت کتێبە کۆنەکان هێشتا پۆلێن نەکراون.



لە لایێکی دیکەوە ژمارەی کتێبخانەکان روو لە زیادبووندان و ئەو کۆمەڵە کتێبانەش پێویستیان بە پۆلێنکردنە. ژمارەی کەمی پۆلێنکەرانی پسپۆڕی و شارەزا ناتوانرێت وەڵامدەرەوەی ئەو هەموو ئەرك و کارەبن.

هەروەها ئەو سەرچاوانەی کە سەبارەت بە پۆلێنکردنن وەك ((لیستی کتێبەکانی پۆلێنکراو)) و ((کتێبناسی میللی ئێران)) (چاپی نوێ) لە بەردەستدا نین و یادرەنگ دەگاتە دەستی پۆلێنکەرانەوە و ئاشکرایە کە ناکرێ تاکاتی چاپ و بلاوکردنەوەی و وەرگرتنی ئەو سەرچاوانە، پۆلێنکردنی کتێبەکانی دوابخرێت. کۆسپێکی دیکەی ئەو سەرچاوانە ئەوەیە کە هەموو کتێبە چاپکراو و بلاوکراوەکان ناگرێتەوە. لەم رووەوە ناتوانین کارتی پۆلێنی هەندێك لە کتێبەکان لەوانەدا بدۆزینەوە.

لە روانگەی پۆلێنکردنی پێش لە بلاوکردنەوە کە دەبێتە هۆی خێرایی و یەکدەستی لە پۆلێنکردنی کتێبەکان لە عاست ولاتدا، سەرەڕای هەوڵ و تێکۆشانی کتێبخانەی میللی ئێران و هاوکاری کتێبخانە گەورەکان لەگەڵیدا، بە هۆی رێژەی زۆری چاپکراوە فارسییەکان. هێشتا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە کتێبەکان کارتی پۆلێنکراوی پێش لە بلاوبوونەوەیان لە پشت لاپەڕەی ناوونیشاندا نییە.

لە ئێران هێشتا رایلکەی کتێبناسی (Bibliographic Network) وەك oclc و wln و ئەوەی کە چەندین ساڵە لە ولاتانی پێشکەوتوو دامەزراوە نییە تالەو لە رێگایەوە هەر کتێبخانەیەك هەم پێشینەی کتێبە پۆلێنکراوەکانی خۆی بخاتە نێو رایلکە و هەمیش لە زانیارییەکانی کتێبناسی کە ئێستا هەیە بۆ پۆلێنکردنی کۆمەڵە کتێبەکانی خۆی کەڵکی لێوەرگرێت رایلکەی کتێبناسی بۆ پێکهێنانی یەکدەستی لە پۆلێنکردن و بەرگری لە دووپاتکردنەوەی کارەکان بە کەڵك دێت. هەروەها لە خەرج و هێزە پسپۆڕ و کارامەکان دەست پێوەگرتنێکی بەرچاوی هەیە، بەو مانایەی کە هەر کتێبێك تەنیا بۆ یەکجار لە ولاتدا پۆلێن دەکرێت و دوای ئەوەی کە پێشینەی کتێبناسی کتێبك خرایە نێو رایلکەوە لە لایەن کتێبخانەی میللییەوە پێداچوونەوە لەسەر دەکرێت، کتێبخانەکانی دیکە دەتوانن بە کەڵکوەگرتن لە

فۆرمەت مارك (MARC) لەگەڵ یەکتر پێشینەکان بگۆڕنەوە. بوونی رایلکەی شیاو و هەورەها فۆرماتی شیاو بۆ گۆڕینەوە و زانیارییەکانی کتێب لە پێداویستییەکانی سەرەکی بۆ دامەزراندنی رایلکەی کتێبناسی.

سەرەڕای ئەو خاڵانەی کە ئاماژەیان پێکرا کتێبە چاپییەکانی فارسی کە بەشێکی زۆر لە کتێبخانەکان پێکدێنن، لە رووی بنەما و یاساکانی چاپ و تۆمارکردنی زانیاری کتێبناسی لە لاپەڕەی ناوونیشان، هەورەها لە لاپەڕەی پشتەوە کەموکوڕی زۆریان هەیە. نووسەران، وەرگێڕان و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و چاپخانەکان خۆیان پابەند ناکەن بە بنەما سادە و ساکارەکانی بڵاوکراوەکان لەم رووەوە نەبوونی زانیاری پێویست و دروست لە کتێبەکان دەبێتە هۆی تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر بۆ پۆلێنکەرانەوە.

بەتێکرا ئەو کەند و کۆسپانە بوونەتە هۆی ئەوەی کە پۆلێنکردنی کتێبە فارسییەکان سەخت و دژوار بێتە بەرچاو و تاپۆییێکی تایبەت بەخۆوە بگرێت. لەم رووەوە لە کاتی پۆلێنکردنی ئەو چەشنە کتێبانەدا دەبێ بە وردی سەرنجی بدرێتێ، ئەزموونی زۆرتر وەربگرێت و بەشێوەیەکی باش توێژینەوە لەسەر کتێبەکان بکات.



# بەشی سێیەم

## پۆلێنکردنی باسیاری(وەسفی) (Descriptive Cataloging)

## بنەمای باسیاری (Basis for Description)

پۆلێنکردن و چۆنیەتی بەرهەمەکان پێویستە لەسەر چ بناغەیەك پێکبێت چ لەسەر بناغەی ئەو زانیارییانەی کە لەو بەرهەمەدایە کە پۆلێن دەکرێت؟ یا بەپێی زانیارییەکانی کتێبناسی یەکەمین بەرهەم و سەرچاوە؟ بە واتایێکیتر، بناغەی سەرەکی پۆلێنکردن و باسیاری (Basic unit of description) بەتایبەت لە بەرهەمە بەناوبانگەکاندا وەك (نهج البلاغه)، شاهنامە. هملت و لەو بابەتانە کە دەیان و بگرە سەدان جار پێداچوونەوە، وەرگێڕدراو، تێهەڵکێش، هەڵبژاردە و هتد یان لەسەر کراوە چییە؟ ئەو تەوەرەی بەدرێژایی ئەم دوو سەدەیە بابەتی وتووێژێکی زۆربووە. هەریەك لە بنەماکانی پۆلێنکردنی یاسایی یەکێك لەم دوو ڕێگایانەی هەڵبژاردووە. بنەماکانی پۆلێنکردنی ئەنلگو-ئەمریکەن (پێداچوونەوەی دووەهەم، بناغەی چۆنیەتی هەمان ماددە دەزانێت کە پۆلێندەکرێت: هاوکاتیش، ئەو بنەمایانە بۆ پاراستنی پێوەندی ئەو ماددەیە کە پۆلێندەکرێت لەگەڵ یەکەمین بەرهەم، پێشنیار دەکات کە هەڵبژاردنی سەرشوناسە و شوناسە زیادکراوەکان و چێوەی ئەو بەرهەمانە لەسەر بنچینەی یەکەمین بەرهەم پێکدێت و لەگەڵیدا هاوئاهەنگ بێت.

دابینکردنی بناغەی چۆنیەتی بەستراوەتەوە بەکارکردەکانی کتێبخانەوە:

ئەگەر کارکردی سەرەکی پێرست، دۆزینەوەی کتێبێکی تایبەت بێت کە بە رای پشکێنەرەوە ناسراو و (Finding Function)، پێویستە هەمان بەرهەم کە پۆلێندەکرێت بکرێتە بناغەی چۆنیەتی. ئەگەر ئامانجی پێرست کۆکردنەوە و پیشاندانی بەرهەمە پێوەندیدارەکان لە تەنیشت یەکتردابێت ( collocating function)، دەبێ یەکەمین بەرهەم بکەینە بناغەی چۆنیەتی و بەرهەم پێوەندیدارەکان لەسەر ئەو بناغەیە و بە هەڵبژاردنی شوناسەی سەرەکی و ناوونیشانی گرێبەست یەکسان لەگەڵ یەکەمین بەرهەم باسبکرێت.

ڕێگای دووهەم بەتایبەت لە بوارەکانی زانستی و مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی (وەك ئەدەبیات، فەلسەفە، یاسا، ئایین، هونەر و مۆسیقا) کە بەرهەمە پێوەندیدارەکان زۆرن، شتێکی باش و بەکەڵکە.

لە کاتی چۆنیەتی و باسیاریدا، گرنگیدان بە پێوەندی بەرهەمەکان لەگەڵ یەکتر و نیشاندانی هەر بەرهەمێکی پەیوەستە لەگەڵ یەکەمین بەرهەم بۆ پشکێنەران زۆر گرنگە و لە کاتی پۆلێنکردن و چۆنیەتی بەرهەمەکەدا، بەتایبەت دیاریکردنی شوناسەکان، دەبێ سەرنجی بدرێتێ.

**تایبەتمەندییەکانی کارتی پۆلێنکردن:**

کارتی پۆلێنکردن، کارتێکە کە لە مقەبایی ناسك بە درێژی۱۲,۵ و پانیایی ۷,۵ سەنتیمتر دروستدەکرێت کە لە خوارەوە کونێکی تێدایە شیشی چەکمەکەی ئیندێکس جێگیربێت و لە تێکدانی کارتەکان زانیارییەکانی کتێبناسی لە دوو بەشی سەرەکیدا دەنووسرێن. بەشی یەکەم بریتییە لە زانیارییەکانی باسیاری و بەشی دووهەم بریتییە لە زانیارییەکانی بەراوردی کتێب.

**((بنەماکانی ۱,۵ تا ۱,۱۱))**

نووسنیی زانیارییەکانی کتێبناسی لە سەر کارتی پۆلێن لە بنەمایێکی تایبەت پەیڕەوی دەکات، کە پێویستی بە خوێندنەوە و وردبین هەیە. بە واتایێکی دیکە پێناسەکانی هەر کتێبێك لەسەر شێوازێکی تایبەت و بەریزبەندی دیاریکراو لەسەر کارتی پۆلێن دەنووسرێن تا هەمیشە یەك دەستی و هاوئاهەنگی لە پێشینەکاندا بپارێزدرێت. بە شێوەی ئاسایی، پێناسەکانی هەر کتێبێك بەم شێوەیە کە لە خوارەوە دەنووسرێن لەگەڵ هێما تایبەتەکان لەگەڵیاندا دەنووسرێت:

((نووسەر، ناونیشان و زانیارییەکانی دیکە، دووپاتکردنەوەی ناوی نووسەر (نووسەران)، نووسەرانی دیکە، زانیاری سەبارەت بە پێداچوونەوە، شوێنی



بڵاوکردنەوە، دەزگای بڵاوکەرەوە، بەرواری بڵاوکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی فیزیکی (رواڵەتی) (ژمارەی لاپەڕەکانی یا بەرگەکان)، زانیاری سەبارەت بە زنجیرەی بڵاوکراوەکان جۆری (شتەکان، بابەت (بابەتەکانی) کتێب، شوناسەکانی دیکە) سەرنج بدەنە ئەو نموونانەی خوارەوە:

**نموونە:**

نووسەر
ناوونیشان: زانیارییەکانی دیکەی ناوونیشان: دووپاتکردنەوەی ناوی نووسەر نووسەرانی دیکە. پێداچوونەوە. شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوە: دەزگا بەرواری بڵاوکردنەوە و چاپ.
ژمارەی لاپەڕەکان یا بەرگەکان: تایبەتمەندییەکانی فیزیکی دیکە:
(پێرست یا زنجیرە) یادداشتەکان
۱- ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی. ۲- ناوونیشانە سەرەکییەکانی دیکەی بابەتی
ا- شوناسەی زیادکراو.
ب- شوناسەی زیادکراوی دیکە.

قەدیری ئەسڵی، باقر
ڕێرەوی ئەندێشەی ئابووری: لە ئەفلاتوونەوە تا کینز
نووسینی باقر قەدیری ئەسڵی، پێشەکی حسێن پیرینا.. پێداچوونەوە
٢- تاران: زانکۆی تاران، ١٣٦٦.
٣٥٨ ص، خشتە، نیشاندەر... (بڵاوکراوەکانی زانکۆی تاران
(١٣٣٤) واژەنامە
کتێب نامە: ل. ٣٥١-٣٥٢
١- ئابووری — مێژوو الف. پیرینا حسێن، پێشەکی نووس
ب- بابەت

**ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاری کتێبناسی:**

**((International Standard Bibliographic Description = ISBD))**

پێشتر (لە بەشی کورتە مێژووی گۆڕانکارییەکانی دەستوورەکان و ستانداردەکانی پۆلێنکردن سەبارەت بە ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاری کتێبناسی ئاماژەیەکی کورت کرا.

ئێستا پێویستە لەم بوارەداش کردنەوەیەکی زۆرترمان هەبێت، لەبەر ئەوەی کە شێوازی نووسینی پێناسەکانی کتێب لەسەر کارتی پۆلێن یا پێشینە و بە لەبەر چاوگرتنی هێماکان و نێوانی ڕستەکان پێویستە لە نێوان بەشەکانی کتێبناسی پێویستی بە زۆرتر لەگەڵ ((ISBD)) هەیە.

شێوازی کاری ئەم ستانداردەیە لەسەر ئاستی کەلکوەرگرتن لە هێماکان و ئەو نیشانانەیە کە دەبێ پێش هەر بەشێکی کتێبناسیدا دابنرێت تا بەم شێوەیە دیار بکرێت کە هەر بەشێك لە زانیارییەکانی کتێبناسی بەبێ لەبەرچاوگرتنی زمان و



خەت پەیوەندی بەچییەوە هەیە و چ واتایەکی هەیە. بەم پێیە، هەر هێمایێك لەو ستانداردەدا دەرخەری چەمکی زانیاری کتێبناسی دوای خۆیەتی، بۆ وێنە هەمیشە پێش لە شوێنی بڵاوکردنەوە، هێمای خاڵ و تەقەڵ (. -) دادەنرێت.

پێشنیار ((سەنتەری کۆنترۆڵی کتێبناسی جیهانی)) (UBC) ئەوەیە، کە کتێبخانەی میللی یا ناوەندی میللی پۆلێنکردن لە هەر وڵاتێك کە یەکێك لە ئەرکەکانی بەرپرسایەتی گۆڕینەوەی زانیارییەکانی کتێبناسی لەگەڵ وڵاتانی دیکەدایە. جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیەی لە ئەستۆدایە. بەتایبەت لە نووسینی کتێب ناسییەکانی میللی دەبێ لەم ستانداردە کەڵك وەربگیردرێت. کتێبخانەکانی دیکەش لەهەر وڵاتێك دەتوانن ستانداردی نوێ بەکاربێنن. لەبەر ئەوەی ئامادەکردن و تێکەڵکردنی کارتە نوێیەکان لەگەڵ کارتە کۆنەکاندا کێشەیەك نەهێنن. هەروەهاش سەبارەت بەو کتێبخانانەی کە تازە دامەزراون و دەیانهەوێت کۆمەڵە کتێبەکانی خۆیان پۆلێن بکەن پێشنیار دەکرێت لەم شێوازە کەڵکوەرگرن.

لە ئێران بۆ یەکەمین جار ناوەندی خزمەتگوزاری کتێبخانەکان لەساڵی ١٣٥٦ شێوازی پۆلێنکردنی کتێبەکانی خۆی بەم شێوەیە دەستپێکرد. دوای تێکەڵبوونی ئەم ناوەندە لەگەڵ کتێبخانەی میللی ئێران (١٣٦٣). کتێبناسی میللی ئێران لە ساڵی ١٣٦٣ بەم لاوە بەکەلکوەرگرتن لەو ستانداردە ئامادە و بڵاودەکرێتەوە بۆ زانیاری لە وردەکارییەکانی ستانداردی نێودەوڵەتی چۆنیەتی کتێبناسی سەبارەت بە جۆرەکانی مەودای کتێبخانەی تەماشای بەشی یەکەم ((ڕێساکانی پۆلێنکردنی ئەنگلۆ-ئەمریکەن ٢)) (AACR ٢) بکەن.

سەبارەت بەستانداردی نێودەوڵەتی چۆنیەتی کتێبناسی بۆ ئەو بڵاوکراوانەی کە یەکجار دەنووسرێن دەتوانن سەردانی ئەم سەرچاوەیە بکەن:

((فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی ئەنجوومەنی کاروباری کتێبخانەکان. ستانداردی نێودەوڵەتی کتێبە نامەنووسیی بۆ ئەو بڵاوکراوانەی کە یەکجار دەنووسرێن)) وەرگێڕانی مورتەزا کەوکەبی. ئەهوار: زانکۆی چمران — کتێبخانەی ناوەندی بێ بەروار.

## قۆناغەکانی باسیاری Levels of Description :

ڕێسای ١,٠٠ی ئەنگلۆ-ئەمریکەن بەو قۆناغە وردەکارییانەی کە دەبێ لە چۆنیەتی بەرهەمێکدا باسبکرێت دەستپێدەکات. ئەم ڕێسایە سێ قۆناغی باسیاری بەپێی ئامانجی پۆلێنکردن و ڕێژەی پێداویستی کتێبخانە بە زانیارییەکانی کتێبناسی پێشنیار دەکات. هەر کتێبخانەیەك دەتوانێ یەکێك لەو سێ قۆناغە هەڵبژێرێت و لە پۆلێنکردنی باسیاریدا (بێجگە لەسەر شوناسەکان) ڕەچاوبگرێت.

لە هەندێك شوێندا دەکرێت لەسەر بنچینەیی ئامانجی کتێبخانە و جۆری بەرهەم کە پۆلێن دەکرێت لەهەر قۆناغێکدا کەڵکوەرگرێت.

### ١- یەکەمین قۆناغی باسیاری:

لەم قۆناغەدا، کەمترین زانیارییەکانی کتێب کە دەبێ لە پێشینەی کتێبناسیدا ئاماژەی پێبکرێت، بەم شێوەی خوارەوەیە:

ناوونیشانی تەواو/ ئاماژەیە بە یەکەمین بەرهەم هێنەر، ئەگەر لە ڕووی فیزیکی یا ژمارە و لەگەڵ سەر شوناسەی سەرەکی جیاوازی هەبێت یا ئەوەی کە سەر شوناسەی سەرەکییەکەی نەمابێت. —شیکردنەوەی پێداچوونەوە- وردەکارییەکانی تایبەتی فیزیکی و ڕواڵەتی (یاجۆری بڵاوکردنەوە). — شوێنی بڵاوکردنەوە: یەکەمین دەزگای بڵاوکردنەوە و هتد. —ژمارەی بەرگەکان یا لاپەڕەکان- یادداشتەکان- ژمارەی ستانداردی نێودەوڵەتی کتێب (ISBN).

زۆربەی کتێبخانە چکۆلەکان و مام ناوەندییەکان لەم قۆناغەی باسیاری کەڵك وەردەگرن.



نموونە:

موسەوی، محەمەد عەلی<br>
تەندروستی گشتی/ نووسینی محەمەد مەولودی.<br>
پێداچوونەوەی ٢. تاران: چیهر. ١٣٦٨<br>
٢ ج.<br>
پێداچوونەوەی یەکەم لە ساڵی ١٣٦٠<br>
واژەنامە<br>
ژمارەی ستانداردی نێودەوڵەتی کتێب

### ٢- دووهەمین قۆناغی باسیاری:

لەم قۆناغەدا، کەمترین زانیارییەکانی کتێبناسی پێویست بریتییە لە: ناوونیشانی تەواو (بە شێوەی گشتی) = ناوونیشان بە زمانێکی دیکە، زانیارییەکانی دیکەی ناوونیشان / یەکەمین شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر، شیکردنەوەی نووسەرانی دوایی شیکردنەوەی پێداچوونەوە / شیکردنەوەی یەکەمین کەس پێداچوونەوەی لەسەر کردووە. — وردەکارییەکانی تایبەتی فیزیکی و ڕواڵەتی (یاجۆری بڵاوکراوە). — یەکەمین شوێنی بڵاوکردنەوە، هتد، یەکەمین دەزگای بڵاوکردنەوە، و هتد. — ژمارەی بەرگەکان: وردەکارییەکانی دیکەی فیزیکی: قەبارەکان (قەبارە). — (ناوونیشانی تەواوی زنجیرەی بڵاوکردنەوە / شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر کە پەیوەندی بە زنجیرەی بڵاوکردنەوەوە هەیە، ژمارەی ستانداردی نێودەوڵەتی زنجیرە: ناوونیشانی زنجیرەی غەیرە سەرەکی، ژمارەی ستانداردی نێودەوڵەتی زنجیرەی غەیرە سەرەکی، ژمارەی زنجیرەی سەرەکی).- یادداشتەکان. — ژمارەی ستاندارد (ISBN) قۆناغی دووهەمی باسیاری زۆرتر لە کتێبخانەکانی تایبەتی کە پێویستیان بە زانیاری زۆرتر هەیە، بەکاری دێنن.

**نموونە:**

بابا خانلو، پەروێز
رووەکەکانی لەوەری تایبەت بە ناوچەکانی وشك و نیوە وشك
Forage plants for the arid and semi arid zone
/ وەرگێڕان و ئامادەکردنی پەروێز بابا خانلو، پێشەکی ئیسماعیل
محەمەد، پێداچوونەوەی دووهەم. — تاران: ئەمیرکەبیر، تەورێز،
نوبل، ١٣٦٢
٧٨، ٧٨ ص: دینەدار، خشتە، نیشاندەر، ٢٣ س م. (گیاناسی
ناوچەکانی گەرمیان/ لە ژێر چاودێری ئیسماعیل محەمەد، ٧).
واژەنامە
کتێبنامە: ص. ٧٢-٧٨ (ISBN)

**٣- سێهەمین قۆناغی باسیاری:**

ئەم قۆناغە، چۆنیەتی تەواو و هەمە لایەنەی بەرهەمەکان پیشاندەدا و زۆرتر سەبارەت بەو بەرهەمانە بەکاردێت، کە لە روانگەی کتێبخانەوە گرنگترین و دەبێ زانیاری وردتر بەخوێنەر بدات.

خاڵ و هێما دانان لە باسیاریدا (رێسای ١- oc و ٢- oc)

لە چۆنیەتی بەرهەمەکاندا، بەهەمان شێوە کە ئاماژەی پێکرا لە زنجیرەیەك نیشانەی تایبەت بۆ باسکردنی زانیارییەکانی کتێبناسی کەڵك وەردەگیردرێت. لەم رووەوە، هەر هێماییێك پیشاندەری جۆری زانیارییەکانی دوای خۆیەتی. نیشانەکانی پێویست لە هەر شوێنێك، لە شیکردنەوەکانی هەمان شوێن لە لاپەڕەکانی دواییدا ئاماژەی پێکراوە. لێرەدا جۆرەکانی نیشانە و چەمکەکانی هەر یەکەیان نیشاندەدرێت.



- نیشانەی خاڵبەندیێ (. -) دوای هەر رستە یا بەشێکی گشتی (بێجگە لە بەشی یەکەم یان ناوونیشان، بەشەکانی دیکە کە لەسەر دێڕەوە دەستپێدەکات وەك بەشی چۆنیەتی فیزیکی و رواڵەتی و هەروەهاش یادداشتەکان و ژمارەی (ISBN) دێت.
- نیشانەی خاڵ (.) لە کۆتایی هەر بەشێکدا دێت.
- نیشانەی فاریزە (،) لە نێوان دوو بەرهەمهێنەری هاوبەش، بۆ وێنە دوو نووسەر، هەروەهاش پێش لە بەرواری بڵاوکردنەوە دێت.
- نشانەی فاریزەی خاڵ لە ژێر (؛) لە نێوان دوو بەرهەمهێنەری تێکەڵ، وەك نووسەرێك و وەرگێڕێك، هەروەها پێش لە ژمارەکانی زنجیرە.
- نیشانەی دوو خاڵ (:) پێش لە ناوونشانی غەیرە سەرەکی، ناوی دەزگای بڵاوکردنەوە، تایبەتمەندییەکانی فیزیکی بەرهەم وەك وێنەداربوون و هتد، شیکردنەوەی شوێنی یادداشتەکان، هەروەها لە نێوان زنجیرە سەرەکی و غەیرە سەرەکیدا بێت.
- نیشانەی خەتەلار (/) کە لە پێش ناوی بەرهەمهێنەر لە شوێنی ناوونیشان و ناوی بەرهەمهێنەری لە شوێنی زنجیرە دێت.
- نیشانەی دوو کەوان ( ) کە لە پێش و پاشی زنجیرەدا دێت.
- نیشانەی دووکەوانی گەورە [ ] لە پێش و پاشی هەر جۆرە زانیارییێك کە خودی پۆلێنکەر زیادی دەکات بە باسیاری بەرهەمێکەوە.

**شێوازی پۆلێنکردنی باسیاری:**

ئێستا بەپێی (ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاری کتێبناسی) چۆنیەتی نووسینی زانیارییەکان لە پێشینەی کتێبناسی —کە دەبێ بە شێوەی ریزبەندی جێبەجێ بکرێت شیبکرێتەوە.

کارتێك کە بەم جۆرە ئامادە دەکرێت، کارتی دەستنووسی دایك یا سەرەکی پێدەگوترێت کە ئەگەر لە راست و دروستی کارەکە دڵنیابووین، بەپێی شێوازێکی تایبەت تایپ و بە رێژەی پێویستی کۆپی دەکرێت و دوای ئامادەبوونی کۆتایی. لە

چەکمەکەکانی ئیندێکسی کتێبخانەدا ریز دەکرێن و دەکەونە بەردەست خوێنەرانەوە. لە پۆلێنکردنی کۆمپیوتەریدا، زانیارییەکانی کتێبناسی یەك لە دوایی یەك دەچنە نیو فیلدە تایبەتییەکانەوە تا رێکوپێك دەکرێن.

• ریزبەندی چۆنیەتی (رێسای ۱. ob)

ئەو زانیارییانەی کتێبناسی کە دەبێ لە باسیاری بەرهەمێکدا بێن، بە ریزبەندی تایبەت و بەپێی بەشەکانی خوارەوە لە پێشینەدا دەنووسرێن:

• ناوونیشان و شیکردنەوەی بەرهەم هێنەر.
• پێداچوونەوە.
• وردەکارییە تایبەتییەکان (یا جۆری چاپ و بڵاوکردنەوەی) بەرهەم.
• چۆنیەتی فیزیکی و رواڵەتی.
• زنجیرەکان.
• یادداشتەکان.
• ژمارەی ستاندارد و هەلومەرجی دەستپێڕاگەیشتن (ئامادەکردن).

کە هەر یەك لەو بەشانە، بە چەندین بەشی وردتر دابەشدەکرێن و ریزبەندی نووسینی ئەوانەش شێوازێکی تایبەتی هەیە.

• **ناوی بەرهەمهێنەری سەرەکی:**

ئەگەرچی شێوازی نووسینی ناوی بەرهەمهێنەر یا سەر شوناسە، بەشێك لە ستانداردی نێودەوڵەتی باسیاریی کتێبناسی نییە، بەڵام لێرەدا بە هۆی ئەوەی کە شێوازی کار و ریزبەندی نووسینی تایبەتمەندییەکانی کتێب لە پێشینەی کتێبناسی دەپارێزرێت، سەرەتا لە سەر چۆنیەتی نووسینی ناوی بەرهەمهێنەر دەستپێدەکەین.

بە شێوەی ئاسایی، یەکەمین بەش کە لەسەر کارتی پۆلێن و لە ۲ سەنتیمەتری لێوارەی راست و ۱,۵ سم لای سەرەوە دەنووسرێت، ناوی بەرهەمهێنەری سەرەکی



(نووسەر) بەم مەبەستەش، سەرەتا ناوی دووهەم و پاشان نیشانەی فاریزە یا کاما (،) و دوایش ناوی سەرەکی بەرهەمهێنەر دەنووسرێت. ئەگەر ساڵی لە دایکبوو یا مردن یا یەکێك لەو دووانە دیاربێت، دوای ناوی سەرەکی، نیشانەی کۆما (،) و پاشان دوای ساڵی لە دایك بوو و پێش لە نیشانەی تەقەڵ (-) ساڵی مردن و لە کۆتاییشدا خاڵ دادەنرێت.

**نموونە:**

اذرنگ، عبدالحسین، ۱۳۲۵ —
ازاد، اسدالله، ۱۳۲۶
مرادی، نورالله
شریيتی، علی، ۱۳۱۲-۱۳۵٦

ئەگەر هەر بەشێك لە ساڵی لە دایکبوو یا مەرگ دیار نەبێت، لە شوێنەکەی بۆشایی بۆ بهێڵنەوە

**نموونە:**

اسیموف، ایزاك، ۱۹۳۰ —
حافز، شمس الدین محمد، - ۷۹۳ ك. م.

سەبارەت بە نووسەرانی بیانی بەتایبەت نووسەرانی رۆژئاوایی، ناوی لاتینی ئەوانەش بەهەمان شێوە لە بەرامبەر ناوەکەی ئەو لەسەر بەو لەم (سم) لێوارەی چەپی کارتەکەوە بنووسن.

کاتی کە ساڵی لە دایکبوون و مەرگ لە بەرامبەر ناوە کوردییەکەدا هاتبێت، دووپاتکردنەوەی لە بەرامبەر ناوە لاتینییەکەیدا پێویست ناکات.

**نموونە:**

هەمنگوی، ئێرنسیت، ۱۸۹۸-۱۹٦۱ Hemingway, Ernest

چنۆڤ، ئانتۆان پاولۆیچ، ۱۸٦۰-۱۹۱٤ Chekhov, Anton Pavliorich

کۆنفوسیوس، ۵۵۱-٤۷۹ پ. ز Confucius

میشیما، یوکیۆ Mishima, Yakio

- **شوێنی ناوونیشانی کتێب یا بەرهەم**

**أ- ناو یان ناوونیشانی کتێب یا بەرهەم.**

۱- ناوونیشانی بەرهەمەکە لە درێژی دوای و لە **۳** سم لێوارە راستی کارتەکەوە بنووسن. ناوونیشان کە دەبێ بست بە بست وەك ئەوە بێت کە لە لاپەڕەی ناوونیشاندا هاتووە، پیشانبدرێت.

| |
|---|
| زەرین کوب، عەبدولحوسێن ۱۳۰۱-۱۳۷۸ |
| ازکوچە رندان |

**۲- زانیارییەکانی دیکەی ناوونیشان (رێسای ۱- E۱)**

ئەگەر لە لاپەڕەی ناوونیشانی کتێب یا بەرهەمێکدا، ناوونیشانی غەیرە سەرەکی یا هەر جۆرە زانیارییێکی دیکە، کە پەیوەندی بە ناوونیشانەوە هەبێت و بە دوایدا هاتبێت، ئەوە بە هەمان شێوە، پاش لە نیشانەی دوو خاڵ (:) بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| زەرین کوب، عەبدولحوسێن ۱۳۰۱-۱۳۷۸ |
| ازکوچەرندان: سەبارەت بە ژیان و ئەندێشەکانی حافز |

**۳- ناوونیشانی بەرامبەر (رێسای ۱٫۱ B۱)**

ئەگەر کتێب یا بەرهەمێك دوو ناوونیشانی هەبێت و لە نێوانیاندا وشەی (یا) هاتبێت، ئەوە بەهەمان شێوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشان دەبیندرێت، دەنووسن و لە پێش و پاش وشەی (یا)، کۆما (،) دابنێن.

**نموونە:**

| |
|---|
| دادوەر، هەمزە، ۱۲۷۵-۱۳٤۹. |
| زاندانی قلعە قهقهە، یا، بەسەرهاتی قارەمانییەکانی شاە ئیسماعیلی دووهەم. |

**٤- ناوونیشان بە زمانێکی دیکە یا ناوونیشانی هاوسەنگە (D ١,١)**

ئەگەر لە لاپەڕەی ناوونیشانی بەرهەمێکدا، ناوونیشان بە زمان یا خەتێکی دیکەوە هاتبێت، سەرەتای ناوونیشانی کوردی و پاش لە نیشانەی یەکسانە (=) ناوونیشان بە زمانێکی دیکە یا بەخەتێکی دیکە بنووسن.

**نموونە:**

ئیبن بابویە، محەمەد کوڕی عەلی، - ٣٨١ ک. خ،
وتاری راستی = الاعتقادات

**نموونە:**

ئێران: شورای بەرزی بەرگری
شەڕ = الحرب = The War

**٥- ناوونیشانی درێژ (B٤ ١,١)**

ئەگەر ناوونیشانی کتێبێك درێژ بێت، بەشێك لە کۆتاییەکەی لابەرن و لە شوێنەکەی ٣ خاڵ (...) بە مانای سڕینەوە دابنێن. ئەگەر کردەوەی سڕینەوە دەبێتە هۆی لەتمە لێدان یا نادیاربوونی چەمکی کتێب، ناوونیشانەکە کورت مەکەنەوە و درێژەی ناوونیشانەکە لە دێڕی دوایی لە ٢ سم کارتی پۆلێندا بنووسن.



**نموونە:**

شەهبازی، پەروێز
بیوشیمی عمومی، بۆ پەرەستاران، خوێندکارانی
کۆلێژی پزیشکی، دروستکردنی دارو، خۆراك....

**٦- ناوونیشانی نادیار:**

ئەگەر ناوونیشانی کتێبێك بۆ خۆی روون نەبێت و پێویستی بەشیکردنەوەی هەبێت، رستەیەکی کورتی لە نێو دوو کەوانە ( )، پێ زیاد بکەن.

**نموونە:**

شاو، جۆرج برنارد، ١٨٥٦-١٩٥٠
خانەی اجارەای (شانۆنامە)

**٧- سڕینەوەی وشەکانی غەیرە زەرووری لە سەرەتای ناوونیشانەوە:**

ئەگەر ناوونیشانی کتێبێك یا بەرهەمێك بە چەندین وشە وەك کتێب، نامیلکە، پەرتووك و لەو بابەتانە دەستی پێکردبێت، ئەگەر بوونی ئەو وشانە گرنگ نەبن، بیانسڕنەوە و لە شوێنی ئەوانەدا نیشانەی سێ خاڵ (...) دابنێن.

**نموونە:**

مەولەوی، جەلالەدین محەمەد کوڕی محەمەد ٦٠٤-٦٧٣
ک.م
...مەسنەوی مەعنەوی

شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر یا دووپاتکردنەوەی ناوی نووسەر (ڕێسای ٢,١ ١,١ f, (f) (Statement of responsibility

پاش لە ناوونیشان و زانیارییە پەیوەندارەکانی دیکە، نیشانەی خەتی لار (/) دابنێن و ناوی بەرهەمهێنەر (یا بەرهەمهێنەران) بە هەمان شێوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشانی بەرهەمدا هاتووە، بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| زەرین کوب، عەبدولحوسێن ١٣٠١-١٣٧٨<br>ازکوچەرندان: سەبارەت بە ژیان و ئەندێشەکانی<br>حافز/ نووسینی عەبدولحوسێن زەرین کوب. |

ئەگەر بەرهەمێك سێ نووسەری هەبێت، ناوی ئەوانە بە هەمان شێوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشاندا هاتووە، بنووسن. بێجگە لە نووسەری یەکەم کە ناوی وەك سەر شوناسە هاتووە، بۆ بەرهەمهێنەرانی دیکە لە بەشی خوارەوەی کارتەکە، شوناسەی زیادکراو (added entry) لەبەرچاوبگرن. هەر کات لە بەرهەمێکدا. سەرەڕای ناوی نووسەران چەندین ناوی دیکە وەك وەرگێڕ، هەڵەچن، پێشەکی نووس، پێداچوونەوە و لەو بابەتانە هاتبێت، ئەوانەش بە هەمان شێوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشاندا هاتوون، بنووسن، لە نێوان نووسەران (نووسەری سەرەکی و نووسەری هاوکار) نیشانەی کۆما یا فاریزە (،) و لەنێوان نووسەر و بەرهەمهێنەرانی دیکە وەك وەرگێڕ و کەسانیتر، نیشانەی کۆمای خاڵ لە ژێر (؛) دابنێن. بۆ بەرهەمهێنەرانی دیکەش لە بەشی کۆتاییدا، شوناسە زیادکراو لەبەرچاو بگرن، مەگەر ئەوەی کە نووسینی ناویان گرنگی نەبێت.



**نموونە:**

| |
|---|
| ئیستوارت، یان Stewart, Ian<br>مبانی ریاضیات/ یان ئیستوارت، دەیوی تال، وەرگێڕ محەمەد مەهدی ئیبراهیمی<br>١- مەنتیق حیساب. الف. تال، دیون ارم Tall, David Orme<br>نووسەری هاوکار ب. ئیبراهیمی، محەمەد مەهدی، وەرگێڕ<br>ج. ناوونیشان |

| |
|---|
| عەتار، محەمەد کوڕی ئیبراهیم ٥٣٧-٦٢٨ ك.خ.<br>خەسرەو نامە/ فەرنئەلدین عەتار نەیشابوری؛ هەڵەچن و تەواوکردنی ئەحمەد سوهەیلی خوانساری<br>١. شیعری فارسی — سەدەی ٦ الف سوهیلی خانساری، ١٢٩١ هەڵەچن ب. ناوونیشان |

| |
|---|
| باڵزاك، ئەنۆرە دو، ١٧٩٩-١٨٨٠<br>.Balzac, Hanore de<br>ژنی سی ساڵە / ئەنۆرە دو باڵزاك؛ وەرگێڕانی عەلی ئەسخەر خەبەرزادە: پێشەکی عەبدولعەلی دەس غەیب.<br>الف. خەبەرزادە عەلی، وەرگێڕ ب. دەس غەیب، عەبدولعەلی، پێشەکی نووس |

لە هەموو بەشەکانی سەرەوە کە ئاماژەیان پێکرا، هەر کات زانیارییێك بێجگە لە سەرچاوەی سەرەکی زانیاری (لاپەڕەی ناوونیشان و ئەودیوی لاپەڕەکە)تان وەرگرت، ئەو زانیاریانە بخەنە نێو دوو کەوانی گەورەوە.

کینراد، جوزف، ١٨٥٧-١٩٢٤
Conrad Joseph
مەئموری نهێنی/ جۆزێف کێنراد؛ (وەرگێڕ)
پەروێز داریوش

کۆلۆدی، کارلۆ، ١٨٣٦-١٨٩٠ Colodi, Carlo
پینوکیو، مرۆڤی داریی/ (نووسینی کارلو کولودی)؛
وەرگێڕان سادق چوبەك؛ وێنەکێشان ریچارد فلوتیه.

- **شوێنی پێداچوونەوە (رێسای ١,٢ و ٢,٢) (Edition Area)**

ئەگەر ئەو بەرهەمەکە پۆلێندەکرێت، دووبارە پێداچوونەوە لەسەر نەکرابێت، لە شوێنی پێداچوونەوەدا ئاماژە بەم خاڵە بکەن. زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە پێداچوونەوە لەوانەیە بە چەندین وشەی جۆراوجۆر وەك پێداچوونەوەی نوێ لەگەڵ پێداچوونەوەی نوێی گشتی چاپی نوێ لەگەڵ چاکسازی و گۆڕانکارییەکان، چاپی نوێ لەگەڵ زیادکراوەکان، نووسینەوەی سەرلەنوێ و .... کە بەسەردا هاتبێت. لەوانەیە پۆلێنکەر لەگەڵ توێژینەوەی وردبینانەی کتێب، خوێندنەوەی پێشەکی، یا بەراورد لەگەڵ پێداچوونەوەکانی پێشتر بەم خاڵە بزانێت. لە هەر شێوێنکدا بۆ نووسینی زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە پێداچوونەوەی، سەرەتا نیشانەی خاڵ تەقەڵ (. -) دابنێن و پاشان پێداچوونەوەکە بنووسن.



**نموونە:**

شاملوو سەعید
تەندروستی دەروونی/ نووسینی. س شاملو
- پێداچوونەوە

ئەو زانیارییانەی کە لە دەرەوەی لاپەڕەی ناوونیشان وەرتانگرتوون بیانخەنە نێو دوو کەوانەی گەورە[]، هەورەها ئەگەر لە ژمارە (هەژمار) پێداچوونەوە گومانتان هەبوو، لە بەرامبەریدا نیشانەی پرسیار دابنێن و هەموو رستەکەی پێداچوونەوە بخەنە نێو دوو کەوانی گەورەوە[].

**نموونە:**

تووس، بەهرام
هونەری خوێندنەوە/ بەهرام تووس.. [پێداچوونەوە]

ئەگەر لە لاپەڕەی ناوونیشان وشە یا رستەیەك کە پیشاندەری پێداچوونەوە بێت هاتبێت، ئەو وشەیە یا رستەیە بە هەمان شێوە لە شوێنی پێداچوونەوە دابنێن و بۆ نیشاندانی ئەو خاڵە کە رستەی ئاماژەپێکراو پیشاندەری پێداچوونەوەیە، لە سەرەتای پێداچوونەوە و لە نێو دوو کەوانی گەورەدا[] ئاماژە بەو پێداچوونەوەیە بکەن.

**نموونە:**

قازی، نەسەتئەڵڵا
بەسوی سیمرغ / بە پێنووسی نەسەتئەڵڵا قازی..
[پێداچوونەوە] پێداچوونەوەیەکی تەواو لە پێشەکی. دەق. بەشەکانی دیکە

ئەگەر پێداچوونەوەی بەرهەمی دوایی لە لایەن کەسێکی دیکەوە بێجگە لە نووسەر جێبەجێ کرابێت، ناوی ئەو کەسە پاش لە نووسینی پێداچوونەوە و دانانی نیشانەی خەتی لار بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| قەتران، ئەبو مەنسور، ٤٦٥؟ کۆچی خۆری (دیوان)<br>دیوانی حەکیم قەتران تەبریزیی / بەرامبەر بە نوسخەی چاکسازی کراو لەلایەن محەمەد نەخجەوانی.- (پێداچوونەوە)/ لەگەڵ چەرزین وتار لە بەدیع الزەمان فروازنفر زەنجلاڵا مەنسوری، حەسەن تەقی زادی. تاران. قوقنووس، ١٢٦٢ |

- **شوێن و بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوە و دابەشکردن (ڕێسای ١,٤) (Publication, Distribution Area)**

لە پاش شوێنی پێداچوونەوە، زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوە (شوێنی بڵاوکردنەوە، دەزگای بڵاوکراوە، بەرواری بڵاوبوونەوە) بنووسن پێش لەم شوێنە یانی زانیارییەکانی لاپەڕەی ناوونیشان و پشتی ئەو لاپەڕەیە، سەرەتا شوێنی بڵاوکردنەوە و دوایی نیشانەی دوو خاڵ (:)، ناوی دەزگای بڵاوکەرەوە و پاش لە نیشانەی کۆما (،) ڕێکەوتی بڵاوبوونەوە بنووسن.

نموونە:

| |
|---|
| زەرین کوب، عەبدولحوسێن. ١٣٠١- ١٣٧٨<br>ازکوچەرندان: سەبارەت بەژیان و ئەندێشەی<br>کازم/ نووسینی عەبدولحوسێن زەرین کوب.ـ پێداچوونەوە.- تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٥٣ |



١- شوێنی چاپ و بڵاوبوونەوە (ڕێسای ١,٤ C و ٢,٤ C) (place of publication).

ناوی شوێنی بڵاوبوونەوە بە هەمان شێوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشان یا لە پشتی لاپەڕەکەوە هاتووە یادداشت بکەن. ئەگەر لە شوێنی بڵاوبوونەوەی بەرهەمێك گومانتان هەیە لە نێو دووکەوانی گەورەدا ئاماژەی پێ بکەن و لە بەرامبەریدا نیشانەی پرسیار دابنێن.

نموونە:

| |
|---|
| جەیمس، جان<br>نەخۆشییەکانی گورچیلە لە منداڵان/ نووسینی جان<br>جەیمس، وەرگێڕانی سەعید شەفیعی.- [تەبریز؟] |

ئەگەر شوێنی چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمێك نادیار بێت و لە هیچ سەرچاوەیەك نەتوانرێ بە دەستی بێنن بەجێ ئەوە لە دوو کەوانی گەورەدا[] وشەی ((بێ شوێن)) بنووسن.

نموونە:

| |
|---|
| مورادی، ڕەزا<br>ژیاننامەی، پێشەوای شۆڕش/ ڕەزا موراد<br>.- [ بێ شوێن] |

١- شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوە (ئەگەر شوێنی چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمێکتان بێجگە لە لاپەڕەی ناوونیشان، یا لە پشتی ئەو لاپەڕەیە دۆزییەوە لە نێو دوو کەوانی گەورەدا[] بنووسن.

**نموونە:**

شەریعەتی، عەلی ١٣١٢ — ١٣٥٦
زانیارییەکانی ئیسلامی/ عەلی شەریعەتی.- [مەشهەد]

٢- دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ڕێسای ١,٤ D و ٢,٤ (Publisher) (D)
ناوی دەزگای بڵاوکردنەوەی بەرهەمێك، کە پۆلێن دەکرێت لە لاپەڕەی ناوونیشان یا لە پشت ئەو لاپەڕەیە وەرگرن و لە دوای شوێنی بڵاوبوونەوە بە زیادکردنی نیشانەی دوو خاڵ (:) ئاماژە پێ بکەن.

**نموونە:**

تورك زادە، ئەحمەد
انشاء و نامەنگاری انگلیی/ نووسین و ئامادەکردنی ئەحمەد تورك زادە.-
تاران: پەیکی فەرهەنگ

ئەگەر دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێك نادیاربێت، لە شوێنی ئەوە لە نێو دوو کەوانی گەورەدا [] وشەی ((بیٚ د)) بنووسن ((د)) واتا دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە.



**نموونە:**

عەبدخدایی، محەمەد تەقی
تزکرات دیانتی درحقیقت تشیع/ م.ت عەبدخدایی
.- مەشهەد: (بی د)

ئەگەر دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێك خودی نووسەر یا بەرهەمهێنەر و یا تەنانەت کەسێکی ڕاستەقینەی دیکەبێت، ناوی ئەو کەسە وەك دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە بنووسن. زۆرجار ڕستە گەلێك وەك ((مافی لە چاپدانەوە یا بڵاوکردنەوە تایبەت بە نووسەر یا وەرگێڕ و ((هەموو مافەکان بۆ نووسەر پارێزراون)) و یا ((ئەم کتێبەیە لەسەر سەرمایەی نووسەر چاپ و بڵاوکراوەتەوە)) و لەو بابەتانە، پێشاندەری ئەم خاڵەن.

**نموونە:**

حوسەینیان، ئەبولفەزل
تەکنەلۆژی کارەبا/ وەرگێڕان و نووسینی ئەبولفەزل
حوسەینیان.- تاران: ئەبولفەزل حوسەینیان

ئەگەر بەرهەمێك هاوکات خاوەنی دوو دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە بێت، ناوی هەردووکیان بنووسن و لە نێوانیاندا نیشانەی کۆمای خاڵ لە ژێر (؛) دابنێن.

نموونە:

حوجەتی کرمانی، عەلی
دوعا لە ڕەمەزاندا/ توێژینەوە و شیکردنەوەی عەلی حوجەتی کرمانی.- تاران
فردەوس، ئەل قەبس

ئەگەر بەرهەمێک لە لایەن دوو دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە، لە دوو شاری جیاوازدا چاپ و بڵاوکرابێتەوە، بە شێوەی ریزبەندی ناوی شار و دەزگای یەکەم و دوایی ناوی شار و دەزگای دووهەمی چاپ و بڵاوکردنەوە بنووسن و لە نێوانیاندا نیشانەی فاریزەی خاڵ لە ژێر (؛) دابنێن.

**نموونە:**

| |
|---|
| فەرهەنگ، پەروێز<br>رێنمای خلزینەکاری: بنەماکانی زانستی ئاوخلزکار/ وەرگێڕانی پەروێز<br>فەرهەنگ.- تاران: دنیای نو، ئەسفەهان: میهرگان |

ئەگەر دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەیەک سەر بە رێکخراو یا دامەزراوەیەکی سەرووتر لە خۆی بێت، سەرەتا ناوی رێکخراوەی سەرەکی و دوای نیشانەی فاریزەی خاڵ لە ژێر (؛) ناوی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| ئەشرەف ئەلکتابی، مەنووچهر<br>کتێبناسی کۆمەڵناسی/ ئامادەکردنی مەنووچهر ئەشرەف ئەلکتابی<br>تاران: وەزارەتی فەرهەنگ و پەروەردەی بەرز، ناوەندی بەڵگەکان و<br>بڕوانامەکانی زانستی ئێران |



٣- رێکەوتی چاپ و بڵاوکردنەوە (رێسای F١,٤ و ٢,٤ F) (Date of Publication)

پاش لەناوی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە نیشانەی کۆما (،) دابنێن و رێکەوتی چاپ و بڵابوونەوە کە لە لاپەڕەی ناوونیشان یا لە پشت ئەو لاپەڕەیەدا هاتووە بووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| زەڕین کوب، عەبدولحوسێن، ١٣٠١ — ١٣٧٨<br>از کوچەران: سەبارەت بەژیان و ئەندێشەی حافز/ عەبدولحوسێن زەرین کوب .-<br>پێداچوونەوە<br>.- تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٥٦ |

ئەگەر رێکەوتی چاپ و بڵاوکردنەوە دیار نەبێت، لە شوێنی ئەوەدا لە نێو دوو کەوانی گەورەدا وشەی[ بێ ر] دابنێن. (((ر)) واتا رێکەوت).

**نموونە:**

| |
|---|
| هەمنیگوی، ئەرنیست، ١٨٩٨- ١٩٦١<br>Heming way, Ernest<br>دوورگەلێک لە رزەیدا/ بەرهەمی ئێرنیست هەمنیگوی، ناسر خداب.- تاران: دینار<br>کتێب،[ بێ ر] |

ئەگەر رێکەوتی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێک لە سەرچاوەیەکی دیکە بێجگە لە لاپەڕەی ناوونیشان یا لە پشتی ئەو لاپەڕەیە وەرگرن. ئەوە لە نێو دوو کەوانی گەورەدا[] بنووسن.

**نموونه:**

| |
|---|
| سەعدی، موسڵح عەبدوڵڵا ، ٦٩٢ك،ج<br>بۆ ستانی سەعدی/ بەکەلکوەرگرتن لە نوسخەی پێداچوونەوەی محەمەد عەلی<br>فروغی.- تاران: حوسەینی، |

ئەگەر رێکەوتی چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمێك جێگای گومان بوو، لە نێوان دوو کەوانی گەورەدا [] بنووسن و لە بەرامبەریدا نیشانەی پرسیار دابنێن.

**نموونە:**

| |
|---|
| ئالی ئەحمەد، جەلال،[ ١٣٠٢ — ١٣٤٨ ]<br>سێ تار: کۆمەڵی لێزدە چیرۆکی/ جەلال<br>ئالی ئەحمەد .- تاران: جاویدان، |

ئەگەر بەرهەمێك چەندین رێکەوتی بڵاوکردنەوەی هەبێت، یانی لە ماوەی چەندین ساڵی جیاوازدا و بەبێ پێداچوونەوە چاپ و بڵاوبێتەوە، سەرەتا نوێترین ساڵی چاپ و بڵاوبوونەوە و دوای نیشانەی کۆما (،) یەکەمین ساڵی چاپ یا کۆنترینیان بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| سامی، کازم<br>توێژینەوەی راوبۆچوونە جیاوازەکان سەبارەت بە خەون دیتن/ نووسینی کازم<br>سامی. تاران،<br>١٣٦١، ١٣٥٠. |



ئەگەر بەرهەمێك زیاتر لە یەك بەرگ چاپ و بڵاوکرابێتەوە، سەرەتا یەکەمین ساڵی بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەم و دوای نیشانەی خەتی تایبەت یان تەقەڵ (-)، ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوی دوایین بەرگ بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| جولی، و یلب tolly, williom l.<br>شیمی الی/ و. جولی، وەرگێڕان کەیوان نەجم ئابادی .- تاران: ئەمیر کبیر<br>١٣٤٦ — ١٣٤٨ ج. |

هەرکات سەبارەت بە بەرهەمێکی چەند بەرگی، ساڵی چاپ و بڵاوبوونەوەی یەکەمین بەرگ یا دوایین بەرگ دیارنەبێت، یا چاپی کتێبەکە هێشتا درێژەی هەبێت، شوێنی ساڵی چاپی ئەو بەرگە بە بۆشایی بهێڵنەوە تا دوای دیاربوونی، تەواو بکەن.

نموونە:

| |
|---|
| ئیپۆستل، تام Apostol, Tom<br>ساب دیفرانسیل وانتگـرال / نووسـینی تـام. م: ئەپوسـتل، وەرگێڕانـی عـەلی<br>زەکاوەتی ... (و کەسی دیکـە).- تـاران: ناوەنـدی چـاپ و بڵاوکردنـەوەکانی<br>زانکۆیی ١٣٦ |

**نموونە:**

ستوده تهرانی، حەسەن، ١٢٨٦-
مێژووی دیپلۆماسی گشتی/ حەسەن ستوده تهرانی .-
تاران: زانکۆی تاران، ١٣٣٨- ج

ئەگەر لە سەرچاوە سەرەکی زانیارییەکان، ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێك لەگەڵ ساڵەکانی کۆچی خۆری و کۆچی مانگی و یا ساڵی زاینی هاتبێت، ئەگەر بتانەوێت دەتوانن هەموو ئەو ساڵانە بنووسن و لە نێوانیاندا نیشانەی یەکسانە (=) دابنێن.

**نموونە:**

موتەهەری، مورتەزا ١٢٩٩- ١٣٥٨
خەتمی نەبووەت/ نووسینی مورتەزا موتەهەری
تاران: رێکخرای پڕوپاگەندەی ئیسلامی، ناوەندی پروپانەوەی پێنجەمین ساڵ
وەرگەری شۆڕشی ئیسلامی

**نموونە:**

سەعدی، موسڵح کوڕی عەبدوڵڵا — ٦٩١ ك. م
کوڵستانی سەعدی، فارسی- ئینگلیزی/ وەرگێڕانی ئیدولددها لستك، بە
کۆشش محەمەد حوسین تسیمی.- تاران: فروغی، ١٣٥٠= ١٩٧١ز.



- **شوێنی باسیاری فیزیکی (تایبەتمەندییەکانی فیزیکی و رواڵەتی یا دیمەنی) (رێسای ١,٥ و ٢,٥) (Physical Description Area)**

پاش لە تایبەتمەندییەکانی پێوەندیدار بە بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوە، تایبەتمەندییەکانی فیزیکی کتێب لە دێڕی دوایی و لە ٣ سم لێواری راستەوە بنووسن.

تایبەتمەندییەکانی فیزیکی یا باسیاری ماددی بریتییە لە زانیاری سەبارەت بە ژمارەی لاپەڕەکان (لاپەڕە ژمار)، بەرگەکان، قەبارە، جۆر و چۆنیەتی رەسم و وێنەکان، خشتەکان، نەخشەکان و لەو بابەتانە و هەروەها زنجیرە (زنجیرەی چاپ و بڵاوکردنەوە).

**١- لاپەڕە ژمار (Pagination١,٥) (B)**

ژمارەی لاپەڕەکانی بەرهەمێك کە یەك بەرگە بە شێوەیەکی تەواو و بەرامبەر بە سیستەمی ژمارەکان، پیتەکان یا ئەو نیشانانەن کە لە کتێبەکەدا هاتوون، بنووسن و لە دوایشدا نیشانەی (ل) دابنێن. ((ل))، واتە لاپەڕە).

**نموونە:**

عەبدوە، یەحیا شیمی مەواد سروشتی/ نووسینی یەحیا عەبدوە حەبیبوڵڵا دانش
پەژو — تاران: زانکۆی تاران، ١٣٦٣٠ — ١٣٥٥
٣٤١ل.

ئەگەر لاپەڕەکانی پێشەکی بەرهەمێك بە چەندین نیشانە بێجگە لە لاپەڕە ژمارەی دەق دیاریکرابێت، بۆ وێنە بە پیتی ئەبجەد، ژمارە، پیتی لاتین و لەو بابەتانە، دوایین پیت یا نیشانە بنووسن و دوای کۆما (،) ژمارەی لاپەڕەکانی کتێب بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| زەرین کوب، عەبدولحوسەین ١٣٠١ — ١٣٨٧<br>لەدرکۆچەرندان: سەبارەت بەژیان و ئەندێشەی حافز/ عەبدلحوسەین زەرین. —<br>پێداچوونەوەی دووەم .- تاران: ئەمیر کەبیر، ١٣٥٦<br>یازدە، ٢٨٠ل. |

ئەگەر بەرهەمێك یا لاپەڕەكانی كۆتایی كتێبك بە چەندین نیشانە وەك ئەوانەی كە ئاماژەی پێكراوە دانرابێت بە هەمان شێوە بیانووسن.

**نموونە:**

٢٥٤، شەش ل.

١٢٥، Z١ ل.

د، ٥٧١    IXI ل.

لە هەریەك لەو خالاَنەی سەرەوە، ئەگەر دوایین لاپەڕەی كتێب ژمارەی نەبوو، ژمارە یا نیشانەی پەیوەندیدار لە نێو دوو كەوانی گەورەدا ا[]  بنووسن.

**نموونە:** (٢٥٤) ل.        ١٨٩، (شەش) ل.

ئەگەر لە بەرهەمێكدا، سەرەڕای ژمارەی لاپەڕەی دەق، هەندێك لەو لاپەڕانە كە بە دوای یەكدا (بۆ نموونە لە كۆتایی كتێبدا) رەسم، وێنە، خشتە... هتد یان لەخۆگرتووە و ئەو لاپەڕانەی ژمارەیان بۆ دانراوە، ژمارە و جۆری بابەتەكان لە نێو دوو كەوانی گەورەدا[] بنووسن.

**نموونە:**

١٢١ ل.[٢٠ وێنە]،  ٢٠٥ ل. [١٤ تابلو] خ،  ٣٢٤ ل. .[١٢ لاپەڕە خشتە].



ئەگەر بەرهەمێك زیاتر لە بەرگێكی چاپ و بلاَوكرابێتەوە یا بڕیارە چاپ و بلاَوبكرێتەوە ژمارەی بەرگەكان بنووسن، نموونە: ٢ ج.

ئەگەر بەرهەمێكی چەندین بەرگی كە هەموو بەرگەكانی چاپ و بلاَوكراونەتەوە یان دیارن، تۆزێك لە خوارترەوە، تەنیا نیشانەی «ب» بنووسن. لەم شوێنانەدا پاش لە سالَی چاپ و بلاَوكردنەوەی بەرگی یەكەم، نیشانەی تەقەلَ (-) دابنێن. هەركات ژمارەی بەرگەكان دیاربوو، پێش لە نیشانەی بەرگ (ب) ژمارەی دیاریكراو بنووسن و سالَی چاپ و بلاَوكردنەوەی دوایین بەرگیش لە شوێنی سالَی چاپ و بلاَوكردنەوە تەواو بكەن.

ئەگەر ژمارەی بەرگەكان دیار بێت، بەلاَم چەند بەرگ لە بەرگێكدا بن، ژمارەی بەرگەكان بنووسن و لە نێو دوو كەوانەدا ( ) ژمارەی بەگەكان دیار بكەن.

**نموونە:**

٢ ب. (لە بەرگێكدا)        ل ب. (لە سێ بەرگدا)

هەركات بەرهەمێك لە ژمارەیەك لاپەڕەی جیاوازدا وەك تابلۆی وێنەكێشان یا خۆشنووسی، پۆستر و رەسم و لەو بابەتانە چاپ و بلاَوكرایەوە ژمارەی جۆری بەرهەمەكە بنووسن.

نموونە: ١٤ لاپەڕە ، ٢٦ تابلۆ.

ئەگەر لە بەرهەمێكی چەند بەرگیدا، ژمارەی لاپەڕەكان لە دوای یەك بن، پاش لە نووسینی ژمارەی بەرگەكان، لە نێو دوو كەوانەدا () ژمارەی لاپەڕەكان بنووسن و لە كۆتایشدا نیشانەی «ل» دابنێنن.

**نموونە:** ٣ ب. (١٩١٣) ل.

ئەگەر ژمارەی لاپەڕەكانی بەرهەمێك بە ژمارە و پیتی جۆراوجۆر دیاری كرابن و یا ئەوەی كە ژمارەیان نەبێت، بەم شێوەی خوارەوە بنووسن.

**نموونە:**  ١ ب. (ژمارەی لاپەڕەكان جۆراوجۆر)

١ ب. (لاپەڕەی بێ ژمارە)

**• تایبەتمەندییەکانی دیکەی فیزیکی (C ١,٥)**

پاش لە ژمارەی لاپەڕە، نیشانەی دوو خاڵ (:) دابنێن و ئەگەر ئەو بەرهەمەی کە پۆلێن دەکرێت هەر کام لەو تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەبێت بەم شێوازەی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

٢- قەبارە (Size)

ئەگەر نووسینی قەبارەی کتێب لە روانگەی کتێبخانەوە گرنگ بێت سایزی قەبارەکە بە سەنتیمەتر بنووسن. زۆربەی کتێبخانەکان لە نووسینی قەبارەی کتێب چاوپۆشی دەکەن. نموونە: ٢٩٢ ل : ٢٣ س م.

٣- وێنەکان (Illustrations)

ئەگەر بەرهەمێك چەندین وێنەی لە خۆگرتبێت، بە شێوەی وشەی «وێنەدار» پیشانیبدەن. هەر کات هەموو وێنەکان رەنگی بن: پاش لە وشەی «وێنەدار» لە نێو دوو کەوانەدا ( ) وشەی «رەنگی» و ئەگەر هەموو وێنەکان رەنگی نەبن، لە نێو دوو کەوانەدا ( )، وشەی «بەشێك رەنگی» پێ زیاد بکەن.

نموونە:

٤٧٣ ل: وێنەدار

٢ ب. : وێنەدار (بەشێك رەنگی)

١٩٦، دوازدە ل. : وێنەدار (رەنگی)

٤- رەسم (Photograph)

ئەگەر بەرهەمێکی رەسمی تێدا بێت، بە وشەی ((رەسم)) دیاریبکەن. بەم پێیە ئەگەر ئەو بەرهەمەی کە پۆلێن دەکرێت، سەرەڕای وێنە رەسمیشی هەبێت، پاش لە وشەی «وێنەدار» کاما (،) دابنێن و دوایی وشەی «رەسم» بنووسن.



نموونە:

٢ب. : رەسم     ٣١٤ ل. : وێنەدار، رەسم

٥- نەخشە (Maps)

ئەگەر بەرهەمێك چەندین نەخشەی تێدا بێت، ئەو خاڵە بە نووسینی وشەی «نەخشە» لە دوو کەوانەدا ( )، «تاکراوە» دابنێن.

**نموونە:** ٣٥٣ ل. : نەخشە     ٢ب. : وێنەدار، رەسم، نەخشە (تاکراوە)

**٦- خشتەکان (Tables)**

ئەگەر بەرهەمێك چەندین خشتەی تێدابێت بە نووسینی وشەی «خشتە» ئاماژە بەو خاڵە بکەن.

نموونە:

٥٦٣، ٥١ ل. : خشتە

٧٩ ل. : خشتە

**٧- نموونە (Sample)**

هەر بەرهەمێك کە بریتی بێت لە هەر جۆرە نموونەیەك وەك نموونە یا گراوره لە دەستنووسەکان یا نوسخە خەتییەکان و لەو بابەتانە بە نووسینی وشەی «نموونە» باسی لێوە بکەن.

**نموونە:**

٢ ب. نموونە ٣٤٧، بیست و حەوت ل. : وێنەدار، نموونە.

• شوێنی زنجیرەی یا زنجیرەی چاپ و بڵاوکردنەوە (ڕێسای ١,٦ و ٢,٦) ( Series Area)

ئەگەر بەرهەمێك بێجگە لە ناوونیشانی تەواو، ناوونیشانی گشتی هەبێت کە ژمارەیەکی یا کۆمەڵێك بەرهەمی وەك خۆی دیکەش هەبن، ئەو ناوونیشانە گشتییە کە زنجیرەی پێ دەگوترێت، پاش لە تایبەتمەندییەکانی فیزیکی، لە نێو دوو کەوانەدا ( ) بنووسن پێش لە زنجیرە، نیشانەی خاڵ تەقەڵ (. -) دابنێن و پاشان ناوونیشانی ئەو کۆمەڵە یا زنجیرەیە لە نێو دوو کەواندا ( ) بنووسن. ئەگەر زنجیرە ژمارەی چاپ و بڵاوکردنەوەی تایبەت بە خۆی بێت، ئەو ژمارەیە پاش لە نیشانەی کامای خاڵ لە ژێر (؛) بنووسن.

**نموونە:**

| |
|---|
| ئەرشەقی، عادل<br>ئۆقیانووسەکان- نووسینی: عادل ئەرشەقی. (تاران) کتێبەکانی سپیدە، ١٣٦٦.<br>(٣٦) ل: وێنەدار (ڕەنگی). (زانست بۆ مێرد منداڵان). |

| |
|---|
| **تەوەسول، جەواد**<br>فێربوونی بەرنامەنووسی BASIC بۆ جۆرەها کۆمپیوتەری چکۆلە:<br>نووسینی جەواد تەوەسولی.. تاران.<br>ئێران ئیرشاد.١٣٦٦<br>١٩٣ل: خشتە، نیشاندەر. (کۆمەڵێك وانەی زانستی کۆمپیوتەری: (٢) |



**جۆرەکانی زنجیرەکان:**

١- **زنجیرەی بابەتی:** کە پیشاندەری کۆمەڵێك لە بەرهەمی هاوشێوە لە یەك بابەتدا.

**نموونە:**

٢٥٦ ل. : (گەنجینەی زمان و کەلتوور و ئەدەبی کۆنی ئێران؛ ٧)

٢ ج. : (مێژووی هاوچەرخی جیهان)

٢- **زنیجرەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە:** کە پێشاندەری کۆمەڵێك لە بەرهەمەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەیە.

**نموونە:**

٣٠٢ ل. : وێنەدار (بڵاوکراوەکانی زانکۆی فیردەوسی مەشهەد؛ ٩٦)

٢ب. : خشتە. — (بنکەی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی کتێب): ١٩٣؛ (٢٠)

٢٥٤ ل. : وێنەدار، خشتە، نیشاندەر... (بڵاوکراوەکانی وەزارەتی بەرنامە و بودجە، دەفتەرتر گەڵاڵە داڕشتن و پێکهێنانی سیستەمەکان؛ ٦).

٣- **زنجیرەی دەزگای چاپ و بڵاکردنەوە — بابەت:** کە پێکەوە نیشاندەری زنجیرەی چاپ و بڵاوکراوەکانی دەزگایێك لە کۆمەڵێکی بابەتی تایبەتدا، لەم بارەیەوە، سەرەتا زنجیرەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە و ژمارە (یا ژمارەکان) پەیوەندیداری بەوەوە بنووسن و پاش لە نیشانەی دوو خاڵ (:) زنجیری بابەتی و ژمارەکانی پەیوەندیدار بنووسن.

**نموونەکان:**

٥١٢ ل. : وێنەدار (بەشێك ڕەنگی) . — (ناوەندی چاپ و بڵاوکراوەکانی زانکۆیی: ١١٥: فیزیا: ١٢)

٢ب: نموونە.- (چاپ و بڵاوکراوەکانی زانکۆی تاران: ١٨٥٢ ؛١٨٥٩: گەنجینەی نوسخەی خەتی؛ ٢٣؛ ٢٤).

سەبارەت بە بەرهەمەکانی چەند بەرگی کە چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرگەکانی دیکەی هێشتا دەرنەچوون یا ئەوەی کە بەرگەکانی دیکەی لەبەردەستدا نییە، شوێنی ژمارەی (یا ژمارەکانی) زنجیرەکە نادیارن، بۆشایی بۆ دابین و نیشانەی کۆتایی دوو کەوانە «()» دانێن، پاشان ئەگەر تەواوبوو ژمارەی بەرگەکان، ژمارەکان دەنووسن و نیشانەی کۆتایی دوو کەوانە تەواو بکەن.

**نموونە:**

ب.- نەخشە.- (ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی زانکۆیی؛ ٢١١: کتێب و کتێبخانە؛ ٦

٣ ب.- (چاپ و بڵاکراوەکانی زانکۆی شیراز:٩٧؛

- **شوێنی یادداشتەکان (ڕێسای ١,٧ و ٢,٧) (Notes Area)**

شوێنی یادداشتەکان بەشێك لەو پێشینەیە کە پاش لە شوێنی زنجیرە و لە دێرێکی جیاواز و لە لێواری ڕاست ٣ سەنتیمەتری کارتەکەوە دەستپێدەکات و لەوەدا شیکردنەوەیەك زیادی سەبارەت بەو کتێبە کە باسیاری دەکرێت بە شێوەی یادداشت دەنووسرێت. یادداشتەکان ڕستەهایێکی کورتن کە بە شێوەی ئاسایی ناکرێت ئەوانە لە شوێنی پێشوو (شوێنی ناونیشان و شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر، پێداچوونەوە، بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوە و لەو بابەتانە) بنووسن مەبەست لە ئامادەکردن و نووسینی یادداشتەکان، دانی زانیاری زۆرتر بە خوێنەر و یارمەتیدان بەوە لە ناسینی چاکتری کتێب و لە کۆتاییدا کەلکوەرگرتنی لەو کتێبەیە. بۆ وێنە نووسینی دەقی بەرهەمێك یا نیشاندانی ساڵی پێداچوونەوەکانی پێشوو یا دیاریکردنی ئەوەی کە کتێب واژەنامە یا کتێب نامەی هەیە، دەبێتە هۆی ناساندنی باشتری کتێب و کەلکوەرگرتنی چاکتر لەو کتێبە.



- **جۆرەکانی یادداشتەکان:**

یادداشتەکان بریتین لە شیکردنەوە جۆراوجۆرەکان کە هەر کام بەریزبەندی و بە شێوەی تایبەت دەنووسرێن تا بەردەوام یەکدەستی و هاوئاهەنگی لە کارتەکانی پێرستدا بپارێزدرێن.

١- زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە نرخەوە:

نرخی کتێب لەسەر بنچینەی ئەوەی کە لەکتێبەکەدا هاتووە، پاش لە نووسینی وشەی ((نرخ)) لە شوێنی یادداشتەکان بنووسن. نووسینی نرخ گرنگ نییە لە زۆر شوێندا نانووسرێت.

**نموونە:**

نرخ: ٣٧٠٠ دینار نرخ: ٤٧٥٠ دنیار (یەك دەورە)

٢- زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە ناوونیشانەوە:

زانیارییەکانی دیکەی پەیوەندیدار بە ناوونیشانەوە کە لە شوێنی ناوونیشان جێی نابێتەوە. لەم شوێنەدا بیهێنن. ئەم زانیاریانە لەوانەیە بە شێوازی جۆراوجۆر بن کە شێوەی پیشاندانی هەر کام لەوانە لە خوارەوە ئاماژەی پێدەکرێت.

- **سەرووی ناوونیشان:**

ئەگەر لە لاپەڕەی ناوونیشانی بەرهەمێکدا وشەی یا ڕستەیەکی کورت لە سەرووی ناوونیشانی تەواوەوە هاتبێت: ئەوە لە پاش نووسینی ڕستەکە ((سەرووی ناوونیشان و پاش لە نیشانەی دوو خاڵ (:) بێنن و ئەگەر پێویستی بوو شوناسەیەکی زیادکراو لە کۆتاییدا بۆی لەبەرچاوبگرن.

**نموونە:** لە سەرووی ناوونیشان: مێژووی هاوچەرخی ئێران کە لە سەرووی لاپەڕەی ناوونیشانی بەرهەمێك بەناوی ((حیزبە سیاسییەکانی ئێران)) هاتووە.

- **ناوونیشانی سەرەکی**

ئەگەر ئەو بەرهەمەی کە باسیاری لێوە دەکرێت، وەرگێڕدراو لە زمانێکی دیکەوە بێت ناوونیشانی سەرەکی ئەو بەرهەمە پاش لە نووسینی رستەی ((ناوونیشانی سەرەکی)) و نیشانەی دوو خاڵ (:) بنووسن.

نموونەکان ناوونیشانی سەرەکی: Test book of Biochemistry

ناوونیشانی سەرەکی: Psychologies Social

ناوونیشانی سەرەکی: الاشارات و التنبیهات

- **ناوونیشان بە زمانێکی دیکە:**

سەبارەت بە کتێبە وەرگێڕدراوەکان، ئەگەر ناوونیشانی سەرەکی بە زمانی یەکەم لەبەردەستدا نەبێت یانەکرێت تایپی بکەین (وەك خەتی رووسی یا چینی و لەو جۆرانە)، ناوونیشان بە زمانێکی دیکە لەبەردەست دایە، بنووسن.

نموونە:

ناوونیشان بە ئینگلیزی: Differentral and Integral Calculus

ئەو کتێبەی سەرەوە بە زمانی رووسی نووسراوە، بەلاّم وەرگێڕدراوی بە زمانی ئینگلیزی هەبووە و وەرگێڕدراوە فارسییەکەشی لەسەر وەگێڕدراوی ئینگلیزی بووە.

ناوونیشان بە فەرەنسی: Histolre la Science

ئەو کتێبە سەرەتا بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە، بەلاّم ناوونیشانە ئەڵمانییەکەی لە سەرچاوەکاندا نەدۆزراوەتەوە.

- **ناوونیشای پشت بەرگ بە زمانێکی دیکە:**

هەر کات لە پشتی بەرگی بەرهەمێکدا، ناوونیشانەکەی بە زمانێکی دیکە بێجگە لە زمانی دەق هاتبێت، ئەوە پاش لە رستەی ((ناوونیشانی پشت بەرگ بە...)) (ئەو زمانەکەی دەتانەوێت) و نیشانەی دوو خاڵ (: ) بنووسن.



نموونە:

ناوونیشانی پشت بەرگ بە ئینگلیزی : History of Modern Iran

ئەو ناوونیشانەی سەرەوە لە پشت بەرگی بەرهەمێك بەناوی ((مێژووی هاوچەرخی ئێران)) هاتووە. ناوونیشانی پشت بەرگی بە فەرەنسی:

Phisique Industriel

ئەو ناوونیشانەی سەرەوە لە پشت بەرگی بەرهەمێك بەناوی ((فیزیای پیشەیی)) هاتووە.

- **لاپەڕەی ناوونیشان بە زمانێکی دیکە:**

ئەگەر بەرهەمێك لاپەڕەیەکی ناوونیشان بە زمانێکی دیکەی هەبێت جیاواز لە زمانی دەقی سەرەکی بێت، ئەو خاڵە بە رستەی ((ل. ن. ب)) ئەو (زمانەی کە دەتانهەوێت) نیشانبدەن و بەرامبەریدا ناوی بەرهەمهێنەر و ناوونیشانی بەرهەمەکە بەو زمانەی کە دەتانهەوێت بنووسن.

**نموونە:**

ل. ن. بە ئینگلیزی: Faramarz Soleimani, Maternal Untyition

ناوونیشانی سەرەوە لە کتێبی ((خۆراکی دایك)) نووسینی فەرامەزر سولەیمانی، هاتووە.

ل. ن بە فەرەنسی Kavousi Boroumand. Dictionaire Francais

ناوونیشانی سەرەوە لە کتێبی ((فەرهەنگی فەرەنسی-فارسی)) نووسینی کاویس برومەند هاتووە.

- **ناوونیشانی بەرگ:**

ئەگەر ناوونیشانی سەر بەرگی بەرهەمێك لەگەڵ ئەو ناوونیشانەی کە لەسەر لاپەڕەی ناوونیشانەکەیدا جیاوازییان هەبێت، لە یادداشتێکدا بە رستەی

((ناوونیشانی سەر بەرگ و نیشانی دوو خاڵ (:) ئاماژەی پێبکەن و لە بەشی کۆتاییدا شوناسەیەکی زیادکراوی بۆ لەبەرچاو بگرن.

**نموونە:**

ناوونیشانی سەر بەرگ: گیا دەرمانی

ناوونیشانی لاپەڕەی ناوونیشانی ئەو کتێبەیە ((دەرمان بە گیا دارویی))یە.

- **ناوونیشان لە رووی سەر بەرگەوە:**

ئەگەر بەرهەمێك لاپەڕەی ناوونیشانی نەبێت یا لاپەڕەی ناوونیشانەکەی نەمابێت، ناوونیشانی سەر بەرگ وەك ناوونیشانی تەواو لە بەرچاو بگرن و لە یادداشتێکدا بە نووسینی رستەیەك وەك ((ناوونیشان لە رووی سەر بەرگەوە)) بە نیشانەی خاڵ ئاماژەی پێ بکەن و لە بەرامبەریدا شتێکی پێ زیاد مەکەن.

**نموونە:**

ناوونیشان لە رووی سەر بەرگەوە

- **ناوونیشانی دیکە:**

هەر کات بەرهەمێك بەتایبەت بەرهەمە لە مێژینەکان، لەگەڵ ناوونیشانێکی دیکەشەوە، بەناوبانگ و ناسراوبن، لە یادداشتێکدا بە رستەی ((ناوونیشانی دیکە)) و نیشانەی دوو خاڵ (: ) ئاماژە پێ بکەن.

**نموونە:**

ناوونیشانی دیکە : اعلام الملوك

ناوونیشانی ئەو بەرهەمە لە لاپەڕەی ناوونیشاندا ئەمەیە ((راحە الصدور ایە السرور لە مێژووی تالی سەلجوق)).



- **ناوونیشانی کەعبی کتێب**

ئەگەر ناوونیشانی کەعبی کتێبێك لەگەڵ ناوونیشانی لاپەڕەی ناوونیشاندا جیاواز بێت ئەگەر ئەو جیاوازییە گرنگ بێت لە یادداشتێکدا ئاماژەی پێ بکەن و لە کۆتایشدا شوناسەیەکی زیاد کراوی بۆ لەبەرچاو بگرن.

**نموونە:**

ناوونیشانی کەعبی کتێب زعفەران

ناوونیشانی تەواوی کتێبەکە بەم شێوەیە: ((زەیتی زەعفەرانی ئێران))

- **ناوونیشانی چاپەکان یا پێداچوونەوەکانی دیکە**

ئەگەر ناوونیشانی ئەو کتێبەی کە وەسفی لێوەدەکرێت لەگەڵ ناوونیشانی چاپەکان یا پێداچوونەوەکانی دیکە (وەك چاپەکان یا پێداچوونەوەکانی پێشووتر) جیاوازییان هەبێت، لە یادداشتێکدا ئاماژەی پێ بکەن و شوناسەیەکی زیادکراوی لە کۆتاییدا بۆ رەچاو بکەن.

**نموونە:**

ناوونیشانی چاپی یەکەم: بیویشمی

ناوونیشانی ئێستای ئەم کتێبە ((ژینگەی کیمیا))یە

چاپی یەکەم لەگەڵ ناوونیشان. وایەرکێشی ناوخۆی بینا.

ناوونیشانی ئێستای بەرهەم ((ئەلف و بێ وایەرکێشی بۆ تەکنسینی کارەبا))یە

پێداچوونەوەی دووهەم لەگەڵ ناوونیشان: گەشت نامەی رابینو

ناوونیشانی پێداچوونەوەی سێهەم: ((گەشت نامەی مازندەران و ئەستر ئابادە))

- **ناوونیشانی بەرگەکانی دیکە:**

هەرکات سەبارەت بە بەرهەمێکی چەند بەرگی، ناوونیشانی بەرگەکانی دیکە لەگەڵ ناونیشانی بەرگی یەکەم جیاوازییان هەبێت، لە یادداشتێکدا ئاماژەی پێ بکەن و شوناسەیەکی زیادکراوەی لە کۆتاییدا بۆ لەبەرچاو بگرن.

**نموونە:**
ناوونیشانی بەرگی دووهەم: جیهانبینی فەلسەفی
کە ناوونیشانی بەرگی دووهەم ((تیۆری ناسین لە فەلسەفەی ئێمەدا))یە
ناوونیشانی بەرگی سێهەم و چوارەم: سازەکان
ناوونیشانی بەرگی یەکەمی: ((لێکدانەوەی سازەکان))

**٣- زانیاری سەبارەت بە چاپەکان یا پێداچوونەوەکانی دیکە:**

ئەگەر زانیارییێك سەبارەت بە چاپەکانی دیکە یا پێداچوونەوەکانی بەرهەم لەبەر دەستدابێت کە گرنگ بن، لە یادداشتێکدا ئاماژەی پێ بکەن.

**نموونە:**
چاپی یەکەم: ئەمیر کەبیر، ١٣٤١
چاپی دووهەم: ١٣٦٣ لە دوو بەرگدا
چاپی سێهەم: ١٣٦٦ لە قەبارەی گیرفاندا
پێداچوونەوەی چاپی یەکەم: ١٣٥٩

**٤- زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە بەرهەم وەرگێڕدراوەکان:**

هەرکات پێویست بێت زانیارییێکی دیکە سەبارەت بەو بەرهەمەی کە وەسفی دەکرێت لە شوێنی یادداشتەکان ئاماژەی پێ بکەن، بە رستەیەکی کورت نیشانیبدەن.

**نموونە:** ئەم کتێبەی کە لەبەردەستدایە وەرگێڕدراوی بەشی یەکەم تا سێهەم لەبەرهەمە سەرەکییەکەیە. ئەم کتێبە لە دەقی عەرەبییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی.

**٥- واژەنامە (Glossary)**

ئەگەر کتێبێك واژەنامەی هەبێت (پێرستی واتای وشەکان و واژە تایبەتییەکانی کۆتایی) لە یادداشتێکدا بە وشەی ((واژەنامە)) ئاماژەی پێبکەن.



سەرنج بدەن کە ئەو بابەتە لە کۆتایی کتێبەکاندا لەگەڵ رستە یا وشەی جیاواز وەك: پێرستی واتای وشە تایبەتەکان، واژەنامە، واتای وشەکان و واژەنامەی فەننی، لەو بابەتانە دێت، کە لەوانەیە واژەکان و واتاکانیان هەر دووك بە یەك زمان بن (بۆ وێنە کوردی بە کوردی) یا بە دوو زمانی جیاواز (ئینگلیزی —فارسی، فارسی- ئینگلیزی) و هتد... بێت. بەر هەر شێوە، وشەی ((واژەنامە)) بەڵگەیە لەسەر جۆرەکانی ئەوانە.

**نموونە: واژەنامە**

**٦- کتێب نامە (Bibliography):**

ئەگەر لەبەرهەمێکدا تایبەتمەندییەکانی سەرچاوەکان و ئەو کتێبانەی کە کەڵکیان لێوەردەگیردرێت (لە نووسیندا) هاتبێت، ئاماژە بەو بابەتە بکەن.

ئاگاداربن کە ئەو بابەتە لە بەرهەمەکانی زانستی جۆراوجۆر لەگەڵ وشەکان یا رستەگەلێکی جیاواز وەك: کتێبناسی، پێرستی سەرچاوەکان، پێرستی وەرگێڕدراوەکان، یادداشتەکان و لەو بابەتانەدا دێت. هەروەها لەوانەیە شوێنی ئەوە لەهەر بەرهەمێکدا جیاوازبێت بە شێوەیەکی گشتی شێوازە جۆراوجۆرەکانی کتێب نامە بەم شێوەی خوارەوەیە.

١- هەر کات کتێب نامە لە لاپەڕەکانی تایبەتی بەرهەمێکدا هاتبێت، ئەوەی بەم شێوەیە یادداشت بکەن:
نموونە: کتێب نامە: ل. ١٦٧-١٧٢.
نموونە: کتێب نامە: ب. ٢، ل. ٣٥٣-٣٦٧.

٢- هەر کات کتێب نامە لە کۆتایی هەر بەشێکی بەرهەمێکدا هاتبێت، ئەوەی بەشێوەی خوارەوە یادداشت بکەن.
نموونە: کتێب نامە لە کۆتایی هەر بەشێك.
نموونە: کتێب نامە لە کۆتایی بابەتەکاندا.

٣- هەر کات نامە هەم لە کۆتایی بەرهەمێکدا و هەمیش لە ژێرنووسی لاپەڕەکاندا هاتبێت بەم شێوەی خوارەوە بنووسن.

نموونە: کتێب نامە: ل. ٥٤٢-٥٥٦؛ هەروەها بە شێوەی ژێرنووسی.

٤- هەر کات کتێب نامە بەشێوەی پەرش و بڵاو و نادیار (بێجگە لەو شێوازانەی سەرەوە) هاتبێت بەم شێوە بنووسن.

نموونە: کتێب نامە

### ٧- ناوەڕۆکەکان: (Contents)

ئەگەر بەرهەمێك لە چەندین بەشی جیا جیا و تایبەتی پێکهاتبێت کە هەر کام لەوانە لە رووی ناوەڕۆکەوە جیاوازییان هەبێت (بۆ وێنە بەرهەمێکی چەند بەرگی هەر بەرگی ناوونیشانی غەیرە سەرەکی تایبەتی هەبێت)، ئەگەر نیشاندانی ناوەڕۆکەکان یان دەقی هەر کام لە بەشەکان یا بەرگەکان گرنگ بێت لە یادداشتێکدا پاش لە وشەی (ناوەڕۆکان) و نیشانەی دووخاڵ (:) ئاماژەی پێ بکەن.

١- بۆ بەرهەمێکی یەك بەرگی کە بریتییە لە بەرهەمەکانی جیاواز لە یەك نووسەر، ناوەڕۆکەکان بەم شێوەی خوارەوە بنووسن:

**نموونە:**

ناوەڕۆکەکان: گوڵستان.— بۆستان.- غەزەلەکان.- چیرۆکەکان و پەندەکان ...
ناوەڕۆکەکان: بەشی یەکەم: دەقی شانۆی ئانتی گۆن. —بەشی دووهەم رەخنەکان.
ناوەڕۆکەکان: میراز کەمال ئەدالدین.- زەماوەندی بێ پێ پەتێکی (بەخیلێ): پزیشکی زۆرەملێ (سێ شانۆنامە لە مۆلیێر).

٢- بۆ بەرهەمێکی یەك بەرگی بریتی بێت لە بەرهەمەکانی جیا جیای زیاتر لە یەك نووسەر، ئەگەر ئەو زانیارییانە لە شوێنی ناوونیشان و شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر نەهاتبێت، ناوەڕۆکەکان بەم شێوەی خوارەوە بنووسن:



نموونە ناوەڕۆکەکان: پێنسەد هەزار فیدایی/ نووسینی پیرك فون.- مەرگ لە ژێر ئاسمان/ نووسینی جورج بلورز.- فەرماندە لە پاش خودا/ نووسینی کارل دونتیز.

٣- ئەگەر چەندین بەشی جیاوازی بەرهەمێك لە لایەن کەسانێکی دیکەوە وەرگێڕدرابێتەوە، ناوەڕۆکەکان بەم شێوە بنووسن: ناوەڕۆکەکان: بەشی یەکەم: فەلسەفەی کۆن/ وەرگێڕانی محەمەد لوتفی.- بەشی دووهەم، فەلسەفەی سەدەی بیست/ وەرگێڕانی مورتەزا حەداد. بەشی سێهەم: فەلسەفەی هاوچەرخ/ وەرگێڕانی عەلی بیهنیا.

٤- ناوەرۆکەکانی بەرهەمێکی چەند بەرگی کە ناوونیشانی غەیرە سەرەکییەکانی یا ناوەرۆکی هەر بەرگێکی جیاواز و نادیار بێت، بە شێوەی خوارەوە بنووسن.

ناوەرۆکەکان: ب. ١. مێژووی ئێران پێش لە ئیسلام. — ب.م. پاش لە ئیسلام تا قاجاریە. — ب. بە. دەورانی هاوچەرخ (ناوونیشانی تەواوی ئەم بەرهەمە ((مێژووی چڕوپڕی ئێرانە))

ناوەرۆکەکان: ب.ا. دینامیك درات. ب.٢. دینامیك اجسام صلبی (ناوونیشانی تەواوی ئەم بەرهەمە «دینامیك»)ە.

٥- هەرکات ناوەرۆکی بەشێك یا بەرگێك لە بەرهەمێکدا نادیاربێت، لە شوێنەکەی بۆشایی بۆ بهێڵنەوە تا هەرکات روون دەبێتەوە، تەواو بکرێت.

**نموونەکان:**

ناوەرۆکەکان: ب.١. .-ب.٢. ترۆدینامیك ئاماری (ناوونیشانی تەواو ئەم بەرهەمەیە «ترمۆدینامیکە»)

ناوەرۆکەکان: ب.١. بارودۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی لە دوو سەدەی یەکەمی کۆچی.- ب.٢... (ناوونیشانی تەواوی ئەم بەرهەمە «مێژووی ئەفغانستان پاش ئیسلام»)

**٨- یادداشتەکانی هاوپێچ (with note)**

ئەگەر بەرهەمێك بۆ خۆی کەرستەیەکی دیکە چ لە نووسراوە یا شتێکی دیکە هەبێت لە یادداشتێکدا بە رستە «هاوپێچ» ئاماژەی پێ بکەن.

نموونەکان:

بە هاوپێچی ڕێنمای نەخشەی مێژووی ئێران

بە هاوپێچی پرسیارنامەیەك سەبارەت بە کۆچی لادێی

بە هاوپێچی یەك بەرگ پێرست

بە هاوپێچی یەك شریتی کاسێت.

**٩- یادداشتەکانی غەیرە سەرەکی:**

هەکارت پێویستی کرد زانیارییێکی دیکە بێجگە لەوانەی کە ئاماژەیان پێکرا سەبارەت بەو بەرهەمەی کە باسیاری دەکرێت، لە یادداشتێك ئاماژەی پێ بکەن.

نموونە:

ئەم کتێبە بە بۆنەی کۆنگرەی ڕێزگرتن لە حافز چاپ و بڵاوکراوەتەوە، ئەم کتێبە ڕاپۆرتێکە کە لە لایەن گرووپێك لە کارناسانی ڕێکخراوی یونسکۆ ئامادەکراوە.



# بەشی چوارەم

# پۆلێنکردنی بابەتی

پۆلێنکردنی بابەتی واتا توێژینەوە و لێکدانەوەی بەرهەمێك لە رووی ناوەڕۆك، تەشخیس و دیاریکردنی بابەت (یا بابەتەکان) و هەڵبژاردنی واژە یا واتایێك (ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی) کە بە باشترین شێوە باس لە ناوەڕۆکی بەرهەمەکە بێت بۆ خوێنەر.

بەواتایێکی دیکە «قۆناغێك لە رەوتی پۆلێنکردن کە پەیوەست بە دابینکردنی بابەت بۆ کتێبەکان بێت، لەم رووەوە بریتییە لە ریزبەندی و دیاریکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی ئەو بەشەی لە پۆلێنکردن کە پەیوەندی بە پۆلێنکردنی باسیارییەوە نییە، بەڵکو بابەتی کتێب دیاریدەکات. لە ساڵی ١٩٤٠ بەم لاوە واتا ئینگلیزییەکەی لە لایەن کتێبخانەی کۆنگرەوە بە هەر دوو قۆناغ دیاریکردنی ریزبەندی و بابەت دەگوترا، لە حاڵێکدا ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی لەلایەن بەشی پۆلێنکردنی باسیارییەوە دیاریدەکرا.

بە تێکرا، مەبەست لە پۆلێنکردنی بابەتی پیشاندانی ناوەرۆك و بابەتی کۆمەڵە کتێبەکان و ئەو بەرهەمانە لە کتێبخانەیەك لە رێگای پێرستی بابەتییەوە، تا ئەوەی کە:

١- کارگێڕانی کتێبخانە و خوێنەران بزانن کە کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە بریتین لە چ بابەت گەلێك (بە واتایێکی دیکە پۆششی بابەتی کتێبخانە چییە؟).

٢- بابەت و ناوەڕۆکی هەر کتێبێك چییە.

٣- سەبارەت بە بابەتێك چ کتێبگەلێك لە کتێبخانەدا هەیە.

ئەوەی کە لە پۆلێنکردنی بابەتی شایانی گرنگی پێدانەوە دەبێ رەچاوبکرێت، دابینکردنی شیاوترین، روونترین و سروشتی وشە یا واتایێك کە باس لە بابەتی کتێب و ناوەڕۆکی بکات و بە خوێنەرانی نیشانبدات. لە کاتی بابەت هەڵبژاردن بۆ کتێب، پێویستە دوو خاڵ لەبەرچاو بگرین. سەرەتا ئەوەی کە بابەت و ناوەرۆکی کتێب چییە و خاڵێکی دیکە ئەوەی کە ئەو بابەت یا بابەتانە بە چ شێوە و بە چ وشە یا واتایێك دەکرێت بۆ خوێنەران پیشانبدرێت، تا ئەوان بە ئاسانی و بە خێرایی کتێب یا ئەو کتێبانەی کە مەبەستیانە لە پێرستی بابەتیدا بدۆزنەوە.

## «چۆنیەتی لێکدانەوەی بابەتی کتێبەکان»

بۆ زانینی بابەتی کتێب و لێکدانەوەی ناوەرۆکەکەی دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە دەست پیَ بکەین.

### قۆناغی یەکەم:

لەم قۆناغەدا سەرەتا دەبێ کتێبەکە دیاریبکەین. ئەگەرچی چاکترین و دڵنیاترین رێگا ئەوەیە کە کتێبەکە بخوێندرێتەوە و لەگەڵ وردەکارییەکانی ئاشنابین، بەڵام ئەو پێویستی بە وەخت و کاتێکی زۆرەوە هەیە و هیچ بەرژەوەندییێکی تێدا نییە و جێبەجێ ناکرێت. هەر بۆیە دەبێ بە شێوازێکی دیکە دەستپێبکەین لە زۆربەی کتێبەکاندا ناوونیشانی کتێب دەتوانێ دەرخەری ناوەڕۆکی کتێبەکە بێت. بۆ وێنە ئاماژە بە چەند ناوونیشان دەکەین: وەك: «پزیشکی منداڵان»، «پێشەکییێك لەسەر دەروونناسی گەشەکردن» و «مێژووی شارستانییەت» پیشاندەری بابەتی گشتی ئەو بەرهەمانەن.

بەو حاڵەش هیچ کات بۆ دیاریکردنی بابەتی بەرهەمێك نابێ بە ناوونیشانی ئەو بەرهەمە باس بکەین، لەبەر ئەوەی لە هەندێك شوێندا لەوانەیە ناوونیشان دەرخەری ناوەڕۆك نەبن و تەنانەت خوێنەریش بە لارێدابەرن، وەك «سەفەرێك بۆ مانگ» (کە بریتییە لە کۆمەڵێك شیعر)، ژنانی چکۆلە (سەبارەت بە ژیانی خانەوادەیە) بەم شێوەیە، پۆلێنکەر دەبێ لێکۆڵینەوەی زۆرتر سەبارەت بە بابەتی بەرهەمەکە بکات.

کاتێ کە ناوونیشانی نادیار بێت تا چەمکی بابەتەکە نەگەیەنێت، پێویستە خاڵەکانی دیکە وەك پێرستی ناوەڕۆکەکان و دەقە سەرەکییەکان، پێشەکی وتار پێشەکی و تەنانەت کورتەیەك لەو بەرهەمە توێژینەوەی لەسەر بکرێت. لە هەندێك لە بەرهەمەکاندا. دەکرێت کورتەیەك، یا ناساندنێکی کورت سەبارەت بەو بەرهەمە لە پشتی بەرگەوە بدۆزینەوە. ئەگەر ئەم شێوەش بە ئاکام نەگەیەشت، پۆلێنکەر دەتوانێ لە سەرچاوەکانی دیکە بێجگە لە خودی کتێب وەك کتێبناسییەکان و پێرستە



جۆراوجۆرەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە رەخنە یا وەسفی لە بەرهەمێك دەکەن، بەشی ناسین و رەخنەیی کتێبەکان لە هەندێك بڵاوکراوەکانی دەرەوەی، وەك بڵاوکراوەی زانست، کەیهانی فەرهەنگی و چەندین سەرچاوەی دیکە کە کەڵکوەرگرن. یادەتوانن لە راوبۆچوونەکانی پسپۆڕان وەك مامۆستایانی زانکۆ کەڵکوەرگرن.

### قۆناغی دووهەم:

دوای ناسینی بابەت و ناوەرۆکی تەواوی کتێب، هەنگاوی دوایی ئەوەیە کە بابەتی کورتتری بۆ دیاریبکەین. بۆ ئەو کارەش سەرەڕای بوونی زانیاری گشتی سەبارەت بە بابەتەکانی جۆراوجۆر، دەبێ دەستبکەین بە ناسینی دروستی راوبۆچوونەکانی و ئامانجی نووسەر، کات و شوێنی بابەت، هەروەها شێوەی ئامادەکردنی، بۆ وێنە ئەگەر کتێبێك لە بارەی مێژووی مەشروتەی ئێران بابەت و هەروەها شێوەی ئامادەکردنی ئەو کتێبە بێت. ئەگەر کتێبێك سەبارەت بە مێژووی مەشروتە لە حاڵی پۆلێنکردندا بێت، دەبێ بزانین ئایا ریشەکان و هۆکارەکانی ئەو رووداوەی شیکردۆتەوە یا نەخش چنێکی تایبەت وەك پیاوانی ئایینی لێکۆڵینەوەی کردووە؟

ئایا روودانی شۆڕشی مەشروتە بە گشتی وڵاتی دەگرتەوە یا ئەوەی کە رووداوەکانی یەکشار، وەك تەبریزی لەبەرچاو بوو؟ لەم قۆناغەدا دەبێ جۆری خوێنەرانی ئەو بەرهەمەی کە نووسەر مەبەستییەتی دیاریبکەن، ئایا ئەو کتێبە، بەرهەمێکی لێکۆڵینەوە و لە ئاستێکی بەرزدایە یا ئەوەی کە بۆ خوێنەرانی ئاسایی و بە شێوەیەکی ساکار نووسراوە؟ بەهەرحاڵ، سەرنجدان بە لایەنە تایبەتییەکانی بابەتی کتێب لە دابینکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی پەیوەندیدار زۆر گرنگە. بە گشتی دەبێ ئاماژەی پیَ بکەین کە مەبەست لە دیاریکردنی بابەتی کتێب ئەوەیە کە لە پلەی یەکەمدا خوێنەران بتوانن لەم رێگایەوە، ئەو کتێبەی کە مەبەستتانە بیدۆزنەوە، دوایش بکرێت شوێنی تایبەتی کتێب لە تەنیشت

بەرهەمەکانی هاوشێوەی دیکە دیاریبکرێت، پاش ژمارەی ڕێنمای ئەو کتێبە لەسەر بنچینەی بابەت، دیاریبکرێت.

**قۆناغی سێیەم:**

لە دوایین قۆناغدا دەبێ بابەتەکانی دیاریکراو لە چوارچێوەی واتاکان و واژە پەسەندکراوەکان، مەبەست ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی ( Subject Headings) هەڵبژێرن. بە واتایێکی دیکە، هەر کتێبخانەیەك دەبێ لەسەر بنچینەی یەکێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی (وەك کۆنگرە، سیرز، کتێبخانەی میللی) واتاکانی دەرخەری ناوەڕۆکی کتێب هەڵبژێرێت. بە شێوەی ئاسایی پۆلێنکەر ئەو بابەتەی کە مەبەستییەتی لەگەڵ پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی هەڵدەسەنگێنێت و ئەو واژانەی کە لەو پێرستەدا پێشنیارکراون، وەك بابەتی سەرەکی هەڵدەبژێرێت. ئەو ناوونیشانە سەرەکیانەی کە لەسەرووی کارتی پۆلێنی بابەتی تایپ دەکرێت یا ئەوەی کە لە فایلی بابەتی پێرستەکانی کۆمپیوتەری فایل دەکرێن، دەبێ بە باشترین شێوە ناوەڕۆك و بابەتی کتێب بەخوێنەران پیشانبدات.

بۆ ووردبینی زۆرتر و بەمەبەستی ئەوەی کە کتێب لە فایلی تایبەت و لە تەنیشت بەرهەمە هاوشێوەکان و هاوبابەتییەکان جێگا بگرێت، پێویستە پاش لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی، ئەوانە لەگەڵ هەمان بەرهەمە هاوشێوەکان لە پێرستی بابەتی بەراورد بکرێن تا لە ئاکامی کارەکە دڵنیا بین، لەم هەلومەرجەدا تەماشاکردنی پێرستی بابەتی کتێبخانە و توێژینەوەی ئەو بەرهەمانەن کە پێشتر پێرست کراون، یا سەردانی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان وەك: بنکەی CD – MARC و کتێبناسی میللی زۆر گرنگە بەجێبەجێکردنی ئەم کارە دیقەتی زۆرتر لە هەڵبژاردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی پێکدێت و دەبێتە هۆی هاوئاهەنگی زۆرتر لە پۆلێنکردنی بابەتی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە.



**ژمارەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی پێویست:**

ئەگەر بتوانین ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمەی کە پۆلێن دەکرێت تەنیا بە یەك ناوونیشانی سەرەکی و بە شێوەیەکی تەواو نیشانبدەین، کارێکی زۆر باشە، بەڵام لە زۆربەی شوێنەکاندا، ناوەڕۆکی پێویستی بە زیاتر لە یەك ناوونیشانی سەرەکییە تا بە باشی خوێنەران بناسرێت. بە گشتی یاسایێکی تایبەت سەبارەت بە ژمارەی ناوونیشانەکانی سەرەکی پێویست لە گۆڕێدانییە. هەندێك لە بەرهەمەکان تەنانەت بە پێنج یا شەش ناوونیشانی سەرەکی ناکرێت بە تەواوی نیشانبدرێت.

بە سەرنجدان بە جۆری کتێبخانە، دەتوانین بە ڕێژەی پێویست، ناوونیشانی بابەتی کە هەڵبژێرین. بۆ نموونە ئەگەرچی دەبێ ناوونیشانی سەرەکی کورت و تایبەت هەڵبژێرین وەك بابەتی یەکەم دایبنێن، بەڵام لە هەندێك شوێندا دەتوانین بابەتێکی گشتی بە مەبەستی ئاسانکاری لە دۆزینەوەی بەرهەمێك لە لایەن خوێنەرەوە یا جێگیرکردنی کتێب لە تەنیشت بەرهەمە هاوشێوەکان لەبەرچاو بگرین.

*** ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی (Subject Headings)**

بە هەمان شێوە کە ئاماژەی پێکرا، لە پۆلێنکردنی بابەتی، سەرەتا دەبێ ناوەڕۆکی کتێبەکە توێژینەوەی لەسەر بکرێت و بابەت و بابەتەکانی ئەو بەرهەمە بەو واژانە یا وانەکان پیشاندەری ناوەڕۆکی ئەو کتێبە دیاریبکەن. هەڵبژاردنی واژە یا واتایێکی کە بە باشترین شێوە بابەتی کتێبەکە نیشانبدات دەبێ لەسەر بنەمایێکی تایبەتی جێبەجێ بکرێت، بە شێوەیەك کە هەمیشە ئەو بابەتانەی کە بە کتێبە هاوشێوەکان دەدرێت، هاوئاهەنگ و یەکدەستبن، بۆ نموونە هەموو ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بە بیوشیمین —هەرچەند ناوونیشانەکانیان جیاواز بن- واژەیەکی یەکدەست و سابتیان بدرێتێ. روونە کە لەوانەیە بۆ هەر بابەتێك، واژەگەلێکی هاوشێوە یا هاومانا بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر هەبن. بۆ نموونە لە بواری بیوشیمی چەندین واژەی دیکە وەك کیمیا حەیانی، کیمیای ژینگە، کیمیای بایۆلۆژیکی و ژینگەی شیمی کە دەرخەری یەك واتان، بەکاردەبرێن، لەم رووەوە لە ژێر

یاسایێکی تایبەتدا دەبێ یەکێك لەو واژانەی کە مەبەستە و شیاوترە هەڵبژێرن و هەمیشە لە کاتی بابەت دان بەو کتێبانەی کەلەیەك بواردان، بەکاربەرێن. بۆ نموونە لە نێوان واژەکانی سەرەوە، دەتوانین واژەی ((ژینگەی شیمی)) هەڵبژێرن و بۆ هەموو ئەو کتێبانەی کە لەم بارەیەوە نووسراون و دەبێ پۆلێن بکرێن، ئەو واژە دیاریبکەین.

بەم شێوە یەك ریزی و هاوئاهەنگی لە پێرستی بابەتیدا پێکدێت و خوێنەران لە ژێر هەر واژە یا واتاییێك کە بگەڕێین دەتوانن ئەو کتێبەی کە مەبەستیانە بدۆزنەوە.

| |
|---|
| نەفیس، رەزا<br>شیمی حەیاتی نووسینی رەزا نەفیسیدا. وارتانی.<br>پێداچوونەوەی — تاران: چیهر، ١٣٤٥<br>٥٩٦ ل: وێنەدار، نیشاندەر<br>ر. ژینگە شیمی الف، وارتانی، ئارمائیس، نووسەر هاوکار ب. ناونیشان |

| |
|---|
| دانیال زادە، ئالبرێت<br>بنەماکانی بیوشیمی : نووسینی ئالبێرت دانیال زادە، خەلیل زارعیان، تاران: ناوەندی چاپ و بلاوکردنەوەی زانکۆیی، ١٣٦٣<br>ج: وێنەدار، نیشاندەر. (ناوەندی چاپ و بلاوکراوەی زانکۆیی: ٤٩ بیوشیمی، ٣ |

| |
|---|
| هافی، محەمەد حەسەن، ١٣٨٢-١٣٣٤ - شیمی بایۆلۆژی: محەمەد حەسەن حاجی.<br>تاران<br>زانکۆی تاران، چیهر، ١٣٣٢-١٣٣٥<br>م ب.: وێنەدار<br>واژارەمانە - کتێب نامە<br>ر. ژینگەشیمی الف ناونیشان |



بەم شێوەیە واژە یا واتاییێکی شیاوتر و شەفافتر کە وەك واژەی سەقامگیر بۆ گرووپێك لە واژەکانی هاوشێوە پەسەند دەکەین ((ناوونیشانی بابەتی سەرەکی)) و واژەکان یا واتایەکی دیکە ((ئیرجاعەکانی بابەتی)) یان پێ دەڵێن.

**نموونە:**

زیمدت شیمی

بیوشیمی

کیمیای بایۆلۆژیك

کیمیای حەیاتی

کارتەکانی ئیرجاعی لە پێرستی بەم شێوەی خوارەوە ئامادە دەکرێت.

| |
|---|
| بیوشیمی<br>تەماشا بکەن لە:<br>ژینگە شیمی |

| |
|---|
| کیمیای بایۆلۆژیکی<br>تەماشا بکەن لە:<br>ژینگە شیمی |

| |
|---|
| شیمی حەیاتی<br>تەماشا بکەن لە:<br>ژینگە شیمی |

## پێناسەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی

((ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی بە واژە یا واتاییێك دەگوترێ کە لە پێرستی کتێبخانە بۆ دەرخستنی بابەت، یا پەیامی سەرەکی کتێب بەکاردێت)).

بە واتاییێکی دیکە ((واژە یا گرووپێك لە واژەکانی پیشاندەری بابەتێك کە لەو بوارەدا، هەموو مەوداو بەرهەمەکانی پەیوەندیدار بەو بابەتە لە پێرست یا کتێبناسیدا دێن یا لە فایلێکدا ریزدەبن و تەنزیم و ریزبەندیان بەپێی پیتی ئەلف و بێیە)) بەم پێناسانە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە کارگێڕانی کتێبخانە ناتوانن بە مەیلی خۆیان هەرواژە یا واتایەك کە بەمێشکیاندا هات، وەك ناوونیشانی سەرەکی بابەتی هەڵبژێرن و بەکاری بێنن. رێژەی کتێبەکان و بابەتەکانیان، هەروەها جۆراوجۆری واژە هاوشێوەکان بە رادەیەك زۆرن کە زەینی پۆلێنکەر ناتوانێ لەبەریان بکات و لە نێوانیاندا پێوەندی و هاوئاهەنگی پێکبێنێ. هەروەها هەڵبژاردن و دابینکردنی بێ یاسایی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێتە هۆی چەند لایەنی و پەرشوبڵاو لە پێرستی کتێبخانەدا و دۆزینەوەی کتێبە هاوبابەتەکان و هاوشێوەکان زەحمەت دەبێ. سەرەڕای ئەوەش، ئەگەر هەر کتێبخانەیەك بە مەیلی خۆی بۆ کتێبەکان بابەت هەڵبژێرێت بۆ وێنە یەك لە چەندین کتێبخانەدا ناوونیشانی سەرەکی جیاوازیان هەبێت، بنەمای هاوئاهەنگی و یەکریزی کە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی پۆلێنکردنی بابەتییە، بە ئاکام ناگات و خوێنەرانیش لە کاتی کەلکوەرگرتن لە پێرست و دۆزینەوەی ئەو بابەتانەی کە دەیانهەوێت سەریان لێ بشێوێت. لەم رووەوە بۆ هەڵبژاردن و دابینکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی شیاو دەبێ سەردانی ئەو پێرستە ئامادەکراوانە بکەین کە بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکراون و بە ((پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی)) بەناوبانگن.



## بنەماکانی بنەڕەتی نووسینی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی

بە هەمان شێوە کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ بتوانرێت دەستپێڕاگەیشتنی خێرایی و ئاسانی خوێنەران بە ناوەرۆك و بابەتی کتێبەکانی پێکبێنێت. بەم مەبەستەش لە نووسینی پێرست ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی، لەبەرچاوگرتنی چەندین بنەما زەرووره کە گرنگترینیان بریتین لە:

**١- پێوستی خوێنەر:**

گرنگیدان بە پێداویستەکانی خوێنەر گرنگترین بنەما لە نووسینی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتین ئاگایی لە شێوەی پشکنینی پێرستی بابەتی و ئەو وشانەی کە خوێنەر لە زەینی دان و بە شوێنیاندا لە ناوونیشانە سەرەکییەکاندا دەگەڕێ و بە شێوەیەکی گشتی رەوشی گەڕانی خوێنەران لە دۆزینەوەی ئەو کتێبانەی کە پێویستیانە لە رێگای ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتییەوە دەبێ نووسەرانی ئەم پێرستە رەچاوی بکەن. دەبێ سەرنج بدرێت کە پشکێنەران کەسانی جۆراوجۆرن و پێداویستییەکانیان جیاوازن.

**٢- یەکگرتوویی:**

ئەم بنەمایە بەو واتایەیە، کە هەموو کتێبە هاوبابەتییەکان لەگەڵ هەرواژە یا رستەیەك لە خودی کتێبدا هاتووە —لە ژێر ناوونیشانی تایبەتدا قابلی دۆزینەوەیە. لایەنێکی دیکەی یەکگرتوویی ئەوەیە کە هەر جۆرە لەو ناوونیشانە سەرەکییەکان بە شێوەیەکی روون و دیاریکراو و بەتایبەتی بەکاردبرین (چ لە ناوە تایبەتەکاندا، رێکخراوەکان، شوێنەکان و هتد، چ لە حاڵەتێکدا کە بەشێوەی کۆتایی تاك بەکاربردرێن...)

**٣- تەوەرەکانی زمان:**

پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی تا ئەو جێگایە کە دەکرێت دەبێ بە زمانی سروشتی ئەو زمانەی کە کاری پێدەکرێ نزیك بێت، بەڵام ئەم کارە بە ئاسانی جێبەجێ نابێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەناچاری تایبەتمەندییەکانی زمانێك وەك هاوتاکان، هاوشێوەکان، واژەکانی بیانی یا ناوخۆیی و تەوەرەکانی دیکە لە کاتی نووسینی ناوونیشانە سەرەکییەکاندا ڕەچاوبکرێن.

**٤- تایبەتمەندییەکان:**

تایبەتمەندیی یەکێك لە بنەماکانی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتییەکە گرنگی زۆری هەیە. تایبەتمەندی واتا بەجێی بابەتی گشتیتر و هەمە لایەنە دەبێ هەوڵبدرێت تا ناوونیشانی سەرەکی بابەتی تایبەت و ڕاستەوخۆ بەکاربێنن. ناوونیشانی سەرەکی تایبەت واتا ئەو بابەتە کە مەبەستە لە چوارچێوەی واژە یا ڕستەیەکی تایبەت ئامادە بکرێت. چەمکی ڕاستەوخۆ واتا ئەوەی کە ناوونیشانە سەرەکییەکان ڕاستەوخۆ و بەبێ یارمەتی واژەکانی هاوتا لە پێرستدا بێن تا ئەوەی کە کارگێڕ خێراتر و ئاسانتر ئەو بابەتەی کە پێویستییەتی بدۆزێتەوە.

## تایبەتمەندییەکانی گشتی پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی

پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کە بۆ کەلکوەرگرتنی پۆلێنکەران ئامادەکراوە و دەنووسرێت، سەرەڕای ڕەچاوگرتنی بنەما بنەڕەتییەکان، دەبێ ئەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە لەخۆبگرێت:

١- پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ ئاسانترین و گشتیترین واژەکان کە بەکاردەبرێن لە هەر بوارێکدا هەڵبژێرێت تا دۆزینەوەی کتێبەکان لە ڕێگای ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی لە پێرستی بابەتیدا ئاسانتر و خێراتر بێت.



٢- پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ تا ئەو جێگایە کە دەکرێت لە نێوان ئەو واژانەدا بێت کە لە هەر بوارێکدا هەن، واژەی تایبەت هەڵبژێرێت. بەواتایێکی دیکە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ بە ڕادەی مەعقول و مەنتقی تایبەت بن.

٣- توانای ئەوەی هەبێت کە پسپۆڕان و غەیرە پسپۆڕان کەڵکی لێوەرگرن، هەڵبژاردن و ڕێکوپێك کردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ بە شێوەیەك بن کە هەم کەسانی پسپۆڕ لە یەك بواردا بتوانن لە ژێر ئەو بابەتانەی کە مەبەستیانە، بەناو کتێبەکاندا بگەڕێن و بیدۆزنەوە و هەمیش کەسانی ئاسایی بتوانن ئەو کتێبەی کە پێویستیانە لە ڕێگای ناوونیشانە سەرەکییەکانی گشتی و ساکارەوە بدۆزنەوە. بەواتایێکی دیکە، پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ بریتی بێت لە بابەتەکان و واژەکانی فەننی و تایبەتی و هەمیش بابەتەکانی گشتی و هەمەلایەنە لەخۆ بگرێت.

٤- پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی تا ئەو جێگایە کە دەکرێت دەبێ بە زمانی سروشتی و ئەو زمانەی کە کاری پێدەکرێت نزیك بێت. ئەم کارە لە تایبەتمەندییە گرنگەکانە کە خوێنەر دەتوانێت ئەو بابەتە کە لە زەینیدایە، بە ئاسانی لە پێرستی بابەتیدا بیدۆزێتەوە.

٥- ئەگەر دەکرێت لە بەرامبەر ناوونیشانێکی سەرەکی بابەتیدا، ژمارەی ڕیزبەندێکی کۆنگرە و دیویی پیشانبدرێت تا بە پۆلێنکردن لە ڕیزبەندی کتێبدا یارمەتیبدات.

٦- لەو شوێنانەی کە پانتایی و سنووری کارکرد و واتای ناوونیشانە سەرەکییەکانی ڕوون نییە، پێویستە شیکردنەوەیەکی کورت پیشانبدرێت، بەو مانایە لە ژێر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکاندا، یادداشتی پانتایی بنووسرێت تا زەینی پۆلێنکەر سەبارەت بە مانا و بوارە کارکردەکانی ئەوان ڕوون بێتەوە.

٧- لە ژێر هەر ناوونیشانێکی سەرەکیدا پێویستە هەموو بابەتە هاوتاکان و هاوشێوەکان وەك ئیرجاعەکانی بابەتی ئاماژەیان پێبکرێت.

٨- پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەبێ پشتیوانی چاپ و بڵاوکردنەوەیان هەبێت بەو مانایەکە هەڵبژاردن، ریزبەندی و نووسینی ناوونیشانە سەرەکییەکان بەپێی ئەو کتێبانەی کە چاپ و بڵاوکراونەتەوە، لەبەر ئەوەی کە ناوەڕۆك، ناوونیشانە سەرەکییەکان و ئەو واژانەی کە بەکارهاتوون لە کتێبەکاندا، باشترین رێنما و مەلاك بۆ هەڵبژاردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانن، بە هۆی ئەوەی کە هەم نووسەرانی کتێبەکان و هەمیش خوێنەران لەگەڵ واژەکان و ئەو واتانە راهاتوون. روونە هەرچی رێژەی کتێبە چاپ و بڵاوکراوەکان لە یەك بواردا زۆرتربن، ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی ئاسانتر دەکرێت هەڵبژێرین.



## پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە
## (Library of congress subject headings= LCSH)

ئەم پێرستە بریتییە لەو ناوونیشانە سەرەکیانەی کە لە ساڵی ١٨٩٨ تا ئێستا لە لایەن پۆلێنکەرانی بەشی پۆلێنکردنی کتێبخانەی کۆنگرەی ئەمریکا بە کتێبەکانی ئەو کتێبخانەیە دراوە و کەم کەم لەگەڵ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبە نوێیەکان بە رێژە و قەبارەی ئەوانە زیادکراوە.

**یەکەمین پێداچوونەوەی ئەو پێرستە بە ناوونیشانی:**

Subject Heading used in the dictionary catalogues the library of congress لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٩ تا ١٩١٤ بەشێوەی پەرش و بڵاو چاپ و بڵاوکراوەتەوە. ئەم سەرچاوەیە لە درێژایی ساڵەکانی دوایی، چەندین جار پێداچوونەوە و چاکسازیی کراوە و لەگەڵ زیادکردنی ناوونیشانە نوێیەکان، چەندین پێداچوونەوەی لەسەرکراوە. دوایین پێداچوونەوەی ئەو پێرستە پێداچوونەوەی بیست و یەکەمە کە لە ساڵی ١٩٩٨ لە پێنج بەرگدا چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کتێبخانەی کۆنگرە بە درێژایی نێزیك بە یەك سەدە کە لە نووسینی تێدەپەڕی ئاڵۆگۆڕی لە بواری زمانناسی، مێژووی، شێوەی رێکخستن و ... بەسەرداهاتووە. لەگەڵ پێداچوونەوەکانی نوێی ئەم بەرهەمە، دەست نامە یا رێنمایی (Manual) جیاوازی بۆ ئامادەکراوە کە شیکردنەوەی تەواو سەبارەت بەشێوەی رێکخستن و شێوەی کەلکوەرگرتن لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی دەدات بە پۆلێنکەر. ئەم سەرچاوەیە لەم ساڵانەی دواییدا بەشێوەی ئەلیکترۆنیکی لەسەر CD-Rom ئامادەکراوە توانایی زۆرتری هەیە، بەنسبەتی شێوە چاپییەکەی.

دەست پێڕاگەیشتنی راستەوخۆ بە پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە لە رێگای ئینتەرنیت بۆ خوێنەران شیاوترن.

*** پێکهاتە و شێوەی ڕێکخستن:**

لەم پێرستە ئەلف و بێیەدا ناوونیشانە سەرەکییەکان و پەسەندکراوەکان بە پیتی پڕ ڕەنگتر (Bold Face) چاپکراون. لە بەرامبەر زۆربەی ئەوانەدا واژەی لە نێو دوو کەواندا (  ) دەبینرێت کە بە مانای دابەشکردنی جوگرافیایە و لە ڕووی ئەوەوە پۆلێنکەر ڕێگا پێی دراوە ناوی شوێنی جوگرافیای (وڵات، شار، ...) لە ژێر یاساییێکدا لەگەڵ خەتی تەقەڵ (-) بە ناوونیشان زیاد دەکات، هەروەها ژمارەی ڕیزبەندی کۆنگرەش لە زۆربەی شوێنەکاندا لە بەرامبەر بابەتەکاندا هاتووە، کە ڕێنوێنی پۆلێنکەر دەکات لە ڕیزبەندی کتێبدا. لە هەندێك شوێندا کە یەك ناوونیشانی سەرەکی لە بوارە جۆراوجۆرەکان کاری پێدەکرێت، چەندین ژمارە لە هەر بوارێکدا پیشاندراوە. لە ژێر هەندێك لە ناوونیشانەکاندا، شیکردنەوەیەکی کورت بە ڕستەی یادداشتی پانتایی (scope note) ئامادەکراوە کە بوار و کارکردەکەیان ڕوونتر دەکاتەوە. لە کاتی کەلکوەرگرتن لەو ناوونیشانە، خوێندنەوەی یادداشتی پانتایی پێویستە.

*** یاسای ئیرجاعەکان لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرەدا:**

یاسای ئیرجاعەکان بەم مەبەستە لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی لەبەرچاوگیراون کە پێوەندی لە نێوان ناوونیشانە سەرەکییەکاندا دیاریدەکات. بە دیاریکردنی پێوەندی لە نێوان ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی، هەم پۆلێنکەر دەتوانێت چەمك و کارکرد باشتر و دروستتری ناوونیشانە سەرەکییەکان دەرك بکات و هەم خوێنەر دەتوانێ بە ئاسانی بە خێرایی بەو بابەتانەی کە پێویستن لە پێرستدا دەستی بگاتێ. سەرەڕای ئەوەش، یەکێك لە ئامانجە گرنگەکانی یاسایی ئیرجاعەکان (بەتایبەت سەبارەت بەو ئیرجاعانە کە بەم شێوە ئاماژەیان پێکراوە ((هەمیش تەماشا بکەن لە)) ئەوەیە کە خوێنەر بە پێوەندی گرتن لە نێوان ئەو ناوونیشانەی کە نسبەت بە یەکتر گشتی و تایبەت بەحسێب دێن یا ئەوەی کە لەیەك ڕیشەن،



سەیتەرەی زۆرتر پەیدا دەکات و لە ئاکامدا دەتوانێ بە کتێبگەلێك زۆرتر لەو بوارانەی کە پێویستە دەستی بگات. ئەو کارەش لە کۆتاییدا هۆکاریکە دەبێتە هۆی کەلکوەرگرتنی زۆرتر لەو کۆمەڵە سەرچاوانەی کە لە یەك کتێبخانەدا هەن.

*** ئیرجاعەکان**

**١- ئیرجاعی U F (Used for= بەکارهاتوو بوو)**

لە بەرامبەر ئەم نیشانەیەدا، ئەو بابەتانە دێن کە واتای هاوشێوە، هاوتاوە یا بە نووسین جیاواز پیشاندەدرێن و لە ڕاستیدا واتاکان ئیرجاعی نسبەت بە ناوونیشانە سەرەکییەکان کە پەسەندکراون. ئەم ناوونیشانە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆی لە ((پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە)) بەپیتی باریك هاتوون و لەگەڵ نیشانەی use (بەکاری بێنن)، بە ناوونیشانی سەرەکی پەسەندکراو ئیرجاعی دەدەن. بەم پێیە، هەر کات پۆلێنکەر بۆ بابەت دان بە بەرهەمێك لەگەڵ ئەم بابەتانەدا بەرەو ڕووبێت، نابێ ئەوانە وەك ناوونیشانی سەرەکی بەکاربێنی، بەڵکو پێویستە ناوونیشانی سەرەکی پەسەندکراو وەك بابەتی کۆتایی هەڵبژێرێت. بۆ نموونە: لە ژێر ناوونیشانی سەرەکی Agricultrual mechinery لە بەرامبەر uf، سێ واتا هاتوون کە بابەتەکانی ئیرجاعی ئەوە لە هەژماردێن.

Agricultural Machinery
UF Agriculture – Equipment and Supplies
Cops – Machinery
Farm – Machinery

بەم پێیە کاتێك کە بۆ یەکەمین جار کتێبێك لەم بارەیەوە پێرست دەکرێت دەبێ هەموو ئیرجاعەکانیشی بە شێوەی کاری ئیرجاعی دروستبکرێن لە نێو ئیندێکسی بابەتیدا دایاننێن.

نموونە :

Farm machinery
See
AGRICULTRAL MACHINERY

**٢- ئیرجاعی BT (Boarder Term= دەستەواژەی گشتیتر):**

لە بەرامبەر ئەم نیشانەیە، ئەو ناوونیشانە دێن کە لە رووی زنجیرەی ریزبەندییەوە بەنسبەتی ئەو بابەتەی کە مەبەست بووە گشتیترە لە راستیدا بابەتەکانی هاوریشە، بەڵام گشتیتر نیشانددات. ئەم ناوونیشانە سەرەکیانە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆی لە پێرستی ناوونیشانەکانی بابەتی کۆنگرە)) بە پیتی رەش هاتوون و لەگەڵ نیشانەی NT (Narrower Term) دەستەواژەی تایبەت بە ناوونیشانی سەرەکی کە مەبەستە ئیرجاع دەدرێن.

Agricultural Machinery

BT Machinery

بەم پێیە، کاتێك کە بۆ یەکەمین جار کتێبێك لەم بوارەدا پێرست دەکرێت، دەبێ ئیرجاعی بەرامبەر نیشانیی BT (بەو شەرتەی کە کتێبخانە لەو بوارە کتێبی هەبن) بەشێوەی خوارەوە ئامادە بکەن و لە ئیندێکسی بابەتیدا دایان بنێن.

Farm machinery
See also
AGRICULTRAL MACHINERY



دەبێ بابەتی گشتیتر لە سەرەوە و بابەتێ کە مەبەستیانە و تایبەتە لە خوار کارتی ئیرجاعەوە بنوسین. لەبەر ئەوەی ئیرجاعی بابەتی گشتییەوە بۆ تایبەتی بە سوودە و یارمەتی خوێنەر دەدات.

بەتێکڕا ئەم ئیرجاعە و ئیرجاعی NT توانایی خوێنەر لە دۆزینەوەی پێوەندی زنجیرەی ریزبەندی لە نێوان دوو ناوونیشانی سەرەکی و لە ئاکامدا زانیاری باشتری ئەو بابەتە کە پێویستە بباتە سەرەوە. بە واتاییێکی دیکە خوێنەر دەتوانێ بابەتەکانی هاو ریشە (چ گشتی یا تایبەتی) بناسێت و ئەگەر پێویست بوو ئەو کتێبانەی کە ناوونیشانە سەرەکییەکانیان گرتووە کەڵکی لێوەرگرێت.

**٣- ئیرجاع RT (Related Term= دەستەواژەی پێوەندیدار، هاوتا)**

لە بەرامبەر ئەم نیشانەدا، ئەو ناوونیشانانە دێن کە لەگەڵ ئەو ناوونیشانانەی کە مەبەستمانە پێوەندییێکی زنجیرەی ریزبەندی لە نێوانیاندا نەبێت، بەڵکو بەنسبەتی ئەو هاوبەهاو هاوتابن.

**نموونە**

Agricultural Machinery

RT from Equipment

Machine-Tractor Stations

بەم پێیە، کاتێك کە بۆ یەکەمین جار کتێبێك لەم بارەیەوە پێرست دەکرێت دەبێ ئیرجاعەکانی بەرامبەر نیشانەی RT (بەو شەرتەی کە کتێبخانە لەو بوارەدا کتێبی هەبن) بە شێوەی خوارەوە ئامادە بکەین.

**نموونە:**

Farm machinery
See also
AGRICULTRAL MACHINERY

**٤- ئیرجاعی SA (See Also= هەروەها تەماشا بکەن):**

لە بەرامبەر ئەم نیشانەیە، یادداشتێك دێت، کە یارمەتی خوێنەر دەدات تا بۆ دۆزینەوەی کتێب گەلێکی زۆرتر کە پێوەندیان بەو بابەتەوە هەیە کە مەبەستە، دابەشکردنێکی وردتری تایبەت کە بە دوای هەندێك لە بابەتەکانەوە هاتووە، گرنگی پێدەدات و لەو پێرستی بابەتی بپشکنێت.

Agricultural Machinery

SA Subdivision Machinery under name of crops, e.g. corn-.machinery

ئەگەر پاش بابەتێك وەك crops، یا چەندین بابەت لەو شێوە، دابەشی غەیرە سەرەکی machinery بێت و لەو بارەیەوە چەندین کتێب لە کتێبخانەدا بن، ئەو کتێبانەش بۆ ئەو خوێنەرەی کە سەبارەت بە Agricultural Machinery دەگەڕێت لەوانەیە توانای کەڵك لێوەرگرتنی هەبێت.

هەروەها لە بەرامبەر نیشانەی SA لەوانەیە شیکردنەوەیەکی گشتی لەسەر ناساندنی هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی تایبەتی پێوەندیدار بە ناوونیشانە سەرەکییەکانەوە کە مەبەستییەتی بدۆزێتەوە SA Special Machinery and Equipment e.g Tractors، هەروەها لەوانەیە لە بەرامبەر ئەم نیشانەیە شیکردنەوەیەك بێت لەسەر ئیرجاعی خوێنەر بە پشکنینی ناوونیشانە سەرەکییەکانی دیکە کە بە وشەیەکی تایبەت دەستپێدەکات.

**نموونە:**

Chemistry

.SA headings… with the word chemical



**٥- ئیرجاعی NT (Narrower Term= دەستەواژەی تایبەتی تر)**

لە بەرامبەر ئەم نیشانەیەدا، ئەو ناوونیشانە سەرەکیانە دێن کە لە رووی گوڕینەوەی زنجیرەی ریزبەندی لە ئاستێکی تایبەتیتر و وردتر جێیان گرتووە بە نسبەت ئەو نیشانە سەرەکیانە کە مەبەستن هاو ریشەن.

**نموونە:**

Agricultural Machinery

NT Agricultural engineering

Agricultural implement

کاتێك کە بۆ یەکەمین جار کتێبێك لەم بوارەدا پێرست دەکرێت، دەبێ ئیرجاعەکانی تایبەتیتر ئەوەش (بەو شەرتە کە کتێبخانە لەو بوارەدا کتێبی هەبن) بەم شێوە ئامادە بکەن.

| |
|---|
| AGRICULTRAL MACHINERY<br>See also<br>AGRICULTRAL ENGINEEING |

واتا خوێنەرێك کە بابەتێکی سەبارەت Agricultural Machinery دەوێت دەتوانێ چەندین بابەتی تایبەتی وەك Agricultural engineering بدۆزێتەوە و ئەو کتێبانەی کە لەوانەیە پێوەندییان بە پێداویستییەکانی ئەوەوە هەبێت بدۆزێتەوە.

- **جۆرەكانی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی لە رووی رواڵەت و شێوەوە:**

لە ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی كۆنگرە، ناوونیشانە سەرەكییەكانی بەشێوەگەلێكی جۆراوجۆر دەبیندرێت كە ئەو كارە پەیوەستە بە جۆری بابەت، تەوەرەكانی زمان و پێویستی خوێنەران هەیە. هەندێك جار ناوونیشانە سەرەكییەكان لە چوارچێوەی یەك واژەی سادە (تەك واژە) و هەندێك جار بەشێوەی رستە (ناو یا خەسڵەت) و هەندێ جاریش بە شێوەگەلێكی تر هاتوون. بە شێوەیەكی گشتی شێوەكانی و جیاوازی ناوونیشانە سەرەكییەكان بریتین لە:

**١- ناوونیشانە سەرەكییەكانی تەك واژەیی (Single noun heading)**

ئەم ناوونیشانە سەرەكیانە سادەترین شێوە لە جۆرەكانی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی كتێب لە قاڵبی یەك واژەدا پیشاندەدرێت، وەك فەلسەفە، گیان، دڵ، ئەدەبیات و ... ئەم ناوونیشانە سەرەكیانە یا تاك یا كۆكە كۆ یا تاك بوونیان پەیوەستە بەو بابەتە كە مەبەستە و تەوەرەكانی زمان هەروەها یەكدەستی و هاوئاهەنگی بابەتی هەیە. بەشێوەی ئاسایی ئەو واژانەی كە دەسەڵاتیان لەسەر چەمكەوە هەیە، بە شێوەی تاك، وەك poetry philosophy medicine و ئەوانەی كە لەسەر شتومەكەكان دەسەلات دەكەن، بە شێوەی كۆ، وەك Birds, Blacks, Stones و لەو بابەتانە دێن.

**٢- ناوونیشانە سەرەكییەكانی دوو واژەیی لەگەڵ ناو و خەسڵەت (Adjective with noun headings)**

رێژەی ئەم جۆرە ناوونیشانە سەرەكیانە لە پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی كۆنگرەدا زۆرن. ئەم ناوونیشانە سەرەكیانە زۆرجار لە ناو و خەسڵەت دروستبوون، وەك Nuclear physics: English. Language, Social Serrvice, Chinese poetry.



**٣- ناوونیشانە سەرەكییەكانی رستەیی (phrase headings)**

ئەم ناوونیشانە سەرەكیانە لە پێكهاتەی دوو یا چەند واژەی پێكەوە لەگەڵ پیتی پێوەند یا پیتی زیادی لە نێوانیاندا پێكدێت. لەم جۆرە ناوونیشانە سەرەكیانەدا، زۆرجار دوو واژە كە پێویستە پێوەندی ئەوان لەگەڵ یەكتر پیشانبدرێت، وەك Technology and Civilization یا دوو واژە كە زۆرجار لە یەك ریشەن یا سەبارەت بە بابەتێكن و زۆرجاران لە كتێبەكاندا پێكەوە دێنە ئاراوە، وەك Booksellers and bookselling, labor and laboring class. پیشاندەری بابەتی كتێبن. هەندێ جار بابەتی كتێب تەنیا بە شێوەی رستەیەك لە چەند وشە پێكهاتووە، نیشاندەدرێت، وەك:

Autonomy in children: Indians of central America: computer input out put equipments; communicable diseases in children

**٤- ناوونیشانە سەرەكییەكانی پێچەوانەیە یا ناو و خەسڵەتی پێچەوانە (Inverted heading)**

ئەم ناوونیشانە سەرەكییانە لە راستیدا هەمان ناوونیشانە سەرەكییەكانی دوو واژەیی ناو و خەسڵەت یا ناوونیشانە سەرەكییەكانی رستەیین كە بە مەبەستی جێگیربوونی واژەی گرنگتر لە شوێنی ئەلف و بێ خۆی بە شێوەی پێچەوانەوە هاتووە لە حاڵەتی زمانی سروشتی هاتووەتە دەرەوە. وەك courtrai, battle of chemistry, oraganic, Art, Iranian: knowledge, theory of.

كە شێوەی سروشتی ئەوانە بەم شێوەی خوارەوە بوون.

Iranian art, theory of knowledge

**٥- ناوونیشانە سەرەكییەكان لەگەڵ واژەی شیكەرەوە ( Heading with gualifier)**

هەندێك جار بۆ روونتركردنەوەی بواری بابەتێك یا كاركردنی یەك ناوونیشانی سەرەكی و هەندێ جاریش بۆ جیاوازی دانان و لە نێوان دوو یا چەند ناوونیشانی سەرەكی هاوشێوە، واژەیەكی شیكەرەوە لە بەرامبەر و لە نێو كەوانە ( ) زیاد دەكرێت. ئەو كارە بۆ نیشاندانی سنووری مانا و كاركرد، تایبەت كردن یان بردنی وەهم و گومان لە ناوونیشانە سەرەكییەكاندایە.

**نموونە:**

(High pressure (Technology
(High pressure (Science
(Cookery (fish
(Marriage (Islamic law
(Marriage (Christianity
(COBOL (computer programming language

**٦- دابەشكردنەكانی غەیرە سەرەكی (Subdivision)**

بۆ نیشاندانی لایەنەكانی تایبەتی یا غەیرە سەرەكی پێوەندیدار بە یەك ناوونیشانی غەیرە سەرەكی لە دابەشكردنەكانی غەیرە سەرەكی بە نیشانەی تەقەڵ (-) پاش لە ناوونیشان سەرەكییەكان بەكاردێت. بە واتاییكی دیكە، دابەشكردنە سەرەكییەكان بۆ تایبەتی كردنی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی بەكاردێن. بۆ نموونە سەبارەت بە (Chemistry) (شیمی) چەندها كتێبی جۆراوجۆر ئامادە و نووسراون كە هەندێكیان كورتە مێژووی كیمیا باسدەكەن هەندێكیشیان بە شێوەی كتێبی وانەیین، هەندێك واژەنامەی زانستی كیمیا ژمارەیەك بە زمانی سادە و ساكار بۆ مندالآن نووسراون، هەندێك تایبەت بە تاقیكردنەوەكانی كیمیایی و ... لەم



حاڵەتەدا پێویستە بە چەندین واژە یا رستەیی تایبەت، هەر كام لە بوارەكانی تایبەتی ئەو زانستە پاش لە خودی ناوونیشانە سەرەكییەكەی (Chemistry) نیشانبدرێت.

**نموونە:**

| | |
|---|---|
| Chemistry | |
| Chemistry – Bibliography | (كتێب كیمیا) |
| Chemistry – Dictionaries | (واژەنامەی كیمیا) |
| Chemistry – Experiments | (تاقیكردنەوەكانی كیمیا) |
| Chemistry – History | (كورتە مێژووی كیمیا) |
| Chemistry – laboratory manual | (دەستووركاری تاقیگە لە كیمیا) |
| Chemistry – study and teaching | (رێبەری فێربوونی كیمیا) |

یا سەبارەت بە وڵاتێك لەوانەیە چەندین كتێبی جۆراوجۆر ئامادە و چاپكرێن كە هەریەك لە بوارێكی تایبەتی باس لەو وڵاتە دەكەن هەر بۆیە پێویستە بە زیادەكردنی دابەشكردنێكی غەیرە سەرەكی و شیاو، بابەتی تایبەت بە هەر كتێبێك بە خوێنەران پیشانبدرێت.

**نموونە:**

| | |
|---|---|
| Iran… Addresses, Essays, Lectures | (كۆمەڵە وتارێك سەبارەت بە ئێران) |
| Iran… Bibliography | (كتێب نامەی ئێران) |
| Iran… Description and Travels | (سەفەرنامەی ئێران) |
| Iran… History | (مێژووی گشتی ئێران) |
| …Iran | |

بۆ نیشاندانی ئەو لایەنە تایبەتی و وردانە یەك ناوونیشانی سەرەكی بابەتی دەكرێت لە دابەشكردنەكانی غەیرە سەرەكی و یەك لە دوای یەك كەڵكوەرگرین.

**نموونە:**

(مێژووی گشتی ئێران) Iran… History

(مێژووی ئێران پێش ئیسلام) Iran… History- pre. Islamic

(مێژووی ئێران پاش ئیسلام) .Iran… History Islamic era

(کتێبناسی مێژووی ئێران پاش ئیسلام)

Iran… History Islamic era. Bibliography

**جۆرەکانی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی:**

بۆ دەرکی باشتری چەمکی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی و کارکردی باشتری ئەوانە، پێویستە ئەوانە لە رووی شێوە و مانا دابەشبکرێن. لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کتێبخانەی کۆنگرە دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی بە شێوەی خوارەوەیە:

**١- دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی بابەتی یا بابەتی ژێر بابەت**
**(Topical subdivisions)**

کە بۆ نیشاندانی لایەنەکانی بابەتی تایبەت بە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی زیاددەکردێت.

**نموونە:**

Libraries… Automation

Education… History

Iran… Politics and Government



**٢- دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی شێوەیی یا فورمی**
**(Form Subdivisions)**

کە بۆ پێشاندانی شێوەی هێنانی کتێبەکان بەکاردێن. واتا چێوەی ناوەڕۆکی بەرهەمەکان نیشاندەدات. وەك واژەنامەکان کە لەگەڵ دەقی کتێبێکی ئاسایی جیاوازییان هەیە.

**نموونە:**

Library science… Bibliography

Chemistry… Dictionary

Education… Periodicals

هەندێك دابەشکردنەکانی شێوەی ئاسایی بریتین لە:

Bibliography

Addresses, Essays, Lectures

Juvenilia Literature

Popular works

Tear books

Hand books manuals, etc

**٣- دابەشکردنەکانی کاتی یا مێژوویی:**

کە دەورە یا کاتێکی تایبەت بە بابەتێکی پێوەندیدار نیشاندەدات و ناوونیشانی سەرەکی لە رووی کاتییەوە تایبەت دەکات. دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کاتی بەشێوەی ساڵ، سەدە دەورە یا بەشێك لە بابەت دێنێ.

**نموونە:**

دەورەیی Iran… History – per Islamic

سەدە Iran… History – ١٩th Century

| | |
|---|---|
| سالّ | Iran… History – ١٩٤٥-١٩٩٠ |
| بەشێك لە بابەت | war of pacific, ١٨٧٩-١٨٨٤ |
| بەشێك لە بابەت | Art, Modern |

**٤- دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی شوێن یا جوگرافیایی**

Geographic Subdivisions

کە سنوورێکی جوگرافیای یا شوێنێك کە پێوەندی بە بابەتەکەوە هەبێت نیشاندەدات.

دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی جوگرافیایی لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە لەگەڵ رستەی may subd Geog لە بەرامبەر هەندێك لە بابەتەکاندا هاتووە. بەو مانایەیە کە ئەو جۆرە دابەشکردنە غەیرە سەرەکییە لواوە. بەم پێیە ناوی شوێنێکی جوغرافیای (شار، ولات، کیشوەر) دەتوانین وەك دابەشکردنی غەیرە سەرەکی جوگرافیایی پاش لە ناوونیشانێکی بێنین.

**نموونە:**

Education (May subd Geog(

Education... France

Education… Iran

پێشنیار دەکرێت ئەگەر ناوی شوێنێکی جوگرافیای کە سەر بە هەرێم، پارێزگا، یا شار و لەو بابەتانەیە، ناوی ئەوانە پاش لە زیادکردنی ناوی ولات بنووسرێت تا بەو شێوەیە هەموو ناوچەکان یان شارەکانی ولاتێك پاش لە یەك ناوونیشانی سەرەکی بە دوای یەکدا بێن و دۆزینەوەیان ئاسانتربێت.

**نموونە:**

Agriculture (May subd Geog(

Agriculture - United stated – Texas

Agriculture – Iran – Khorassan

Agriculture – Iran –Sistan and Baluchestan



سەرەرای ئەو شێوازەی کە دابەشکردنی غەیرە سەرەکی جوگرافیای پاش لە ناوونیشانی سەرەکی دێت بۆ تایبەتی کردنی هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی لە رووی شوێن یا ناوی شوێنی جوگرافیای دەکرێت پێش لە ناوونیشانە سەرەکییەکان بێنن. لەم بارەیەوە لە خوارەوە هەندێك ناوونیشانی سەرەکی یادداشت هەیە کە لەم بارەیەوە دەستووری پێویست پیشاندراوە.

India – Economic Conditions

Japan – Polities and Government

لە هەندێك شوێندا ناوی ناوچەی جوگرافیایی وەك بەشێك لە ناوونیشانی سەرەکی دێت و بەم شێوەیە بابەتەکە لە رووی شوێنەوە تایبەت دەکرێت.

**نموونە:**

Art, Iranian   Greek Tribles

**٥- ناوونیشانی غەیرە سەرەکی گشتی (free flocting subdivisions)**

هەندێك لە دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی دەکرێت لە ژێر هەر بابەتێك بەکاربێنن دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی گشتی پیشاندەری لایەنە گشتییەکانی بابەتین. وەك دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی ((مێژوو))، ((تەشخیس))، ((ئامار)) لە پێداچوونەوەی نوێ ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرە شیکردنەوە سەبارەت بەم دابەشکردنە لە پێشەکیدا هاتووە، هەروەها زۆربەی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کە بە دوای ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونەیی (pattern headings) دێن، کە لە دابەشکردنەکانی گشتی بە حسێب دێن.

❖ شێوەی جێگیربوونی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرە

١- ناوونیشانی سەرەکی.

٢- ناوونیشانی پێچەوانە.

٣- ناوونیشانی سەرەکی لەگەڵ وشەی شیکەرەوە.

**نموونە:**

Children

Children, Adopted

Children, Vagrant

Children (International law(

Children (Roman law(

❖ شێوەی جێگربوونی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی پاش لە ناوونیشانی سەرەکی بابەتی:

١- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی کاتی.

٢- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بابەتی و هتد...

٣- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی شوێن.

**نموونە:**

Education

Education… ١٩٥٤-١٩٦٤

Education… Aims and Objectives

Education… China



*** ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونە یا کلیلی (Pattern Headings)**

ئاشکرایە کە هیچ پێرستێکی ناوونیشانی سەرەکی بابەتی ناتوانێت هەموو بابەتەکان و ناوونیشانە سەرەکییەکان لە خۆبگرێت، کە بەم شێوە قەبارەی ئەوانە زۆر زیاد دەبێت بەم مەبەستە لە پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی، هەندێك لەو ناوونیشانە سەرەکییانە کە دەتوانن لەسەر زۆربەی بابەتەکانی هاوشێوەکار بکەن وەك ناوونیشانی سەرەکی نموونە یا کلیلی بۆ چەندین گرووپ لە بابەتەکان رەچاوکراوە و رێگا بە پۆلێنکەر دەدات بەپێی یاسا ناوونیشانی سەرەکی نووسی دروستبکات. سەرەتا پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرە، لیستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونە لەگەڵ گرووپ یا وتاری بابەتی هەریەك هاتووە، لە کاتی دروستکردنی ناوونیشانی سەرەکی نوێ (بەپێی ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونە) لە دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کە لە دوای ناوونیشانە سەرەکییەکە دا دێت، زۆرجار دەکرێت کەڵکی لێ وەرگرتن. پێرستی ئەو ناوونیشانە سەرەکییانە لە پێشەکی ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرەدا هاتوون.

| | |
|---|---|
| سەبارەت بە فەیلسووفەکان | Thomes Aquinas |
| سەبارەت بە پێغەمبەران | Jesus Christ |
| سەبارەت بە کتێبە پیرۆزەکان | Bible |
| سەبارەت بە شەڕەکان | word war, ١٩٣٤-A٦ |
| سەبارەت بە ولاتەکان | United States Great Britain |

- ئەو ناوونیشانە سەرەکییانەی کە لە پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرە دانیێن، بەڵام بەپێی یاساکانی دەتوانن بین بە بابەت.

هەورەك ئاماژەپێکرا، پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرە هەموو بابەتەکان لەخۆ ناگرێت، بەڵام بەتێکڕا زۆربەی ناوەکانی تایبەتی کە لە گرووپەکانی خوارەوە جێیان دەبنەوە دەتوانن وەك ناوونیشانی سەرەکی کەڵکی لێ وەربگیردرێت.

١- ناوی كەسەكان.
٢- نازناوەكان، بنەماڵەكان، عەشیرەتەكان و نەتەوەكان.
٣- ناوی خودایان و كەسایەتییەكانی ئوستوورەیی و ئەفسانەیی.
٤- ناوی ڕێكخراوەكان و دامەزراوەكان (تنالگانەكان)
٥- ناوی ناوچەكان و شوێنە جوگرافیاییەكان.
٦- بیناكان و شوێنەكانی مێژوویی و بەناوبانگ.
٧- دیاردەكانی سروشتی و جوگرافیای (ئۆقیانووسەكان، دەریاكان، كەنداوەكان، ڕووبارەكان، كێوەكان...).
٨- ناوچەكانی شاری، شارەكان، جادەكان، گۆڕەپانەكان.
٩- ناوی پاركەكان، دارستانەكان، باخەكان.
١٠- كتێبە پیرۆزەكان.
١١- بەرهەمە هونەرییەكان، فلیمەكان، پروگرامەكانی تەلەفزیونی.
١٢- جۆرەكانی گیاكان و ئاژەڵەكان.

## ((پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی سیرز))
## (Sears List of Subject Headings)

ئەم پێرستە ((مینی ئارل سیرز)) (Minie Eerl Sears) لە وەڵام بە داخوازی و پێداویستی كتێبخانە چكۆڵەكانی نووسیویەتی. یەكەمین پێداچوونەوەی لە ساڵی ١٩٢٣ لە ژێرناوی ((پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی بۆ كتێبخانە چكۆڵەكان)) (list of subject heading for small libraries) چاپ و



بڵاوكرایەوە. سیرز بەخێرایی بە گرنگی یەكگرتووی و هاوئاهەنگی لەو ناوونیشانە سەرەكییانە زانی و بنەمای ئەوەی لەسەر پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی كۆنگرە دارشت.

ئەو كارە لە سێ لاوە گرنگ بوو. یەك لەوانە بە پۆلێنكەران ڕێگای دەدا لەو شوێنەی كە پێرستی سیرز ناوونیشانی سەرەكی بابەتی نەبێت پێویستە، لە پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی كۆنگرە كەڵكوەرگرن: لە لایێكی دیكەشەوە خوێنەرانی كتێبخانە چكۆڵەكان، لە كاتی سەردانیان بۆ كتێبخانە گەورەكان و كەلكوەرگرتن لە كارتەكانی بابەتی بە ئاسانی بتوانن لەوانە كەڵكوەرگرن و تووشی كێشە نەبن، سێهەم ئەوەی كە ئەگەر كتێبخانە چكۆڵەكان گۆڕانكارییان بەسەرداهات و بوون بە كتێبخانەی گەورەتر، تێكەڵبوونی كارتەكانی بابەتی ناوونیشانە سەرەكییەكانی سیرز لەگەڵ كارتەكانی بابەتی ناوونیشانە سەرەكییەكانی كۆنگرە بەبێ كێشە جێبەجێ بكرێت و پەرشوبڵاو نەبن. پێداچوونەوەكانی سەرەتایی پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی سیرز، سادەتر و ژمارەی ئیرجاعەكانی كە تەنیا بۆ بابەتەكانی هاوشێوە و هاوتا دروستكرابوون كەمبوون. پێرستی سیرز لە درێژایی ساڵەكانی دواییدا لە لایەن كەسانێكی دیكەوە پێداچوونەوەی لەسەر كراو كەم كەم پەرەیسەند و خۆی پێگەیاند.

ئەم پێرستەش بڕیارە هەرچەند ساڵ جارێك بەسەرنجدان بە تەوەرەكانی زمانناسی پەرەسەند كە زانستەكان و كاركردنی واژەكانی نوێ، هەروەها پێویستی خوێنەران پێداچوونەوەی لەسەر بكرێت. دواین پێداچوونەوە پێرستی سیرز پێداچوونەوەی حەڤدەهەمە كە لە ساڵی ٢٠٠٠ چاپ و بڵاوكرایەوە.

*** پێكهاتە و شێوەی ڕێكخستن:**

هەروەك ئاماژەی پێكرا، پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی سیرز لەسەر بنەمای پێرستی ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی كۆنگرە ئامادە و نووسراون. لەم پێرستەدا، ئەو ناوونیشانە سەرەكیانەی كە پەسەندكراون بە پیتی گەورەتر و

بابەتەکانی پەسەندنەکراو کە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیان بە ناوونیشانی سەرەکی پەسەندکراو ئیرجاع دەدرێن، کە بە پیتی باریکتر نووسراون. لە بەرامبەر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکان، لە نێو دوو کەوانە ( ) رستەی (My subdiv. Geog) هاتووە کە بە پۆلێنکەر رێگا دەدات ناوی شوێنی جوگرافیای بە ناوونیشانی سەرەکی کە مەبەستییەتی زیاد بکات. لە پێداچوونەوەی چوارەم بەم لاوە (بێجگە لە پێداچوونەوەی نۆ و دە)، ژمارەکانی ریزبەندی دیویشی پێدراوە.

ئەگەر ناوونیشانێکی سەرەکی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا لەبەرچاو بێت، ژمارە جیاوازەکانی پێوەندیدار بەهەر بوارێك پیشاندراوە. لە خوارەوە هەندێك ناوونیشانی سەرەکی، یادداشتەکان (Scope note) هاتووە کە سنوور و کارکردنی چەمکی ناوونیشانە سەرەکییەکان روونتر دەکاتەوە.

لاپەڕەی ١٣٣ی کتێبەکە لێرەدا کۆپی بکرێت.

Jewelery ٧٣, ٢٧

See also gems; Goldwork

Silver work; also name

Of specific jewelery

JEWELERY<br>See also<br>GEMS

**٢- ئیرجاعی "X" (گەڕان لە):**

کە پێشاندەری بابەتەکانی هاوتا یا هاوشێوەیە کە بە پیتی باریکتر دیاری کراون هەرکام لەو بابەتانە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیان لە پێرستدا بەپیتی باریکترین و لەگەڵ نیشانەی "See" ئیرجاع دەدرێن بە ناوونیشانە سەرەکییەکانی پەسندکراو.



سەبارەت بە هەر بابەتێك کە یەکەمین جار کتێبێك پۆلێن دەکرێت، دروستکردنی ئیرجاع لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی پەسەند نەکراو بە ناوونیشانە سەرەکییەکانی پەسەندکراو پێویستە.

Biochemistry ٥٧٤,١٩

See also…

X Biological Chemistry

Chemistry, Biological

Biological<br>See<br>BLOSCHEMISTRY

**٣- ئیرجاعی "XX" (هەروەها گەڕان لە):**

ئەم حاڵە پیشاندەری ئەو ناوونیشانە سەرەکییانەیە کە نیسبەت بەو ناوونیشانە سەرەکییانەی کە مەبەستە گشتیتر و بەربڵاوترن. لە کاتی دروستکردنی ئیرجاع بەم شێوەی کاربکەن، کە ناوونیشانە سەرەکییەکە کە گشتیترە لە سەرەوەی کارتی ئیرجاع و ناوونیشانی سەرەکی تایبەت لە خوارەوەی کارتەکەوە و هەردووکیان بە پیتی گەورە لە ٢ سەنتیمەتری لێوارەی لە لای چەپی بەرگەکەوە بنووسن.

Biochemistry ٥٧A.١٩

XX Chemistry

Physiological Chemistry

CHEMISTRY<br>See<br>BLOSCHEMISTRY

## چەشنەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکان:

هەروەك ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە، لە پێرستی سیرزیشدا چەشنەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بریتین لە:

**١- ناوونیشانە سەرەکییەکانی یەك واژەیی یا وشە یەك دانەکان.**

کە ساکارترین شێوەی ناوونیشانە سەرەکییەکانن و هەمیشە لە یەك ناو دروستدەبن.

Education Art Agriculture

**٢- ناوونیشانە سەرەکییەکانی دوو واژەیی یا پێکهاتوو لە ناو و خەسڵەت:**

ڕێژەی ئەم جۆرە ناوونیشانە سەرەکیانە لە پێرستی سیرزدا زۆرن.

Diesel Engines -Choral Music- Folk art

**٣- ناوونیشانە سەرەکییەکانی رستەیی:**

کە ناوەرۆکی کتێبەکان بە رستەیەك کە لە دوو یا چەند ناو پێکهاتووە پیتی پێوەندیدار یا زیادیان لەگەڵە پیشاندەدا.

Medicine and Religion

Office Equipment and Supplies

Photography of animals

Life on the other Planets

**٤- ناوونیشانە سەرەکییەکانی پێچەوانە یا پێکهاتوو لە ناو و خەسڵەتی پێچەوانە:**

ئەم ناوونیشانە سەرەکیانە بە هۆی جێگیربوونی واژەیەکی گرنگتر لە شوێنی ئەلف و بێ شیاو، لە شێوەی سروشتی هاتوونەتە دەرەوە و بە واتایێك پێچەوانە بوون. لە پێرستی سیرزدا ژمارەی ئەم ناوونیشانە سەرەکییانە زۆرنین.

Knowledge, Theory of Philosophy, Ancient



**٥- ناوونیشانە سەرەکییەکانی لەگەڵ واژەی شیکەرەوە یا پێکهاتوو لە ناو و واژەی تەفسیرکەر:**

لە پێرستی سیرزدا لە بەرامبەر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکان و لە نێو دووکەوان ( )، واژە یا چەندین واژە هاتوون، کە چەمك و سنووری کارکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی روون دەکاتەوە. لە هەندێك شوێن کە ناوونیشانێك بە یەك شێوە دەنووسرێت و لەسەر چەندین چەمکی جیاواز دەلالەت دەکات، بە زیادکردنی واژەیەکی تەفسیرکەر یاشیکەرەوە سنوور و مانا و کارکردنی ئەوە دەتوانین روون بکەینەوە.

Bridge Bridge (Dentistry) Bridge (games)

Masks Masks (Plays) Masks (sculpture)

## چەشنەکانی دابەشکردنی غەیرە سەرەکی لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی سیرزدا:

لەم پێرستەدا لە دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کەمتر کەڵك وەرگیردراوە، دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی سیرز بریتین لە:

**١- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی شوێن یا جوگرافیایی**

ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی پێرستی سیرز لە رووی بابەتییەوە بە چەندین شێوە دەتوانین بەدەست بێنین:

أ) لە بەرامبەر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی کە رستەی ( May subdiv. Geog) هاتووە ناوی ئەو شوێنەی کە دەمانهەوێت بە خەتی تەقەڵ (-) پێ زیاد دەکەین.

Labor (May sub div. Geog)

Labor …. Iran

Labor …. France

Education (May subdiv. Geog(

Education… Japan

Education… Turkey

ب) له هەندێك حاڵەتدا، سەرەتا ناوی شوێنی جوگرافیایی و پاشان ئەو بابەتەی کە مەبەستە بە تەقەڵ (-) پێ زیاد دەکەین.

Pakistan-- Social Conditions

United States – History

Iran --- Statistics

ج) له هەندێك شوێندا ناوی شوێنی جوگرافیایی وەك بەشێك له بابەت دێت:

American drama    Brazil literature

**٢- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی کاتی یا مێژوویی:**

ناوونیشانە سەرەکییەکانی سیرز لە رووی کاتییەوە بە شێوەکانی خوارەوە دەتوانین تایبەت بکەین:

أ) بەپێی ساڵ:

United state… History… ١٩٤٥-١٩٥٥

ب) بەپێ دەورە(سەردەم)

Iran… History… pare Islamic

**٣- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی شێوەیی یا فۆرمی:**

کە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی لە رووی شێوەی نیشاندانی ناوەرۆکەوە تایبەت دەکرێت.



Chemistry—Dictionaries

Education—Bibliography

**٤- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بابەتی یا بابەتی ژێر بابەت:**

بۆ تایبەت کردنی ناوونیشانە سەرەکییەکان لە رووی بابەتییەوە (بە بابەتگەلێکی چکۆڵە یا وردتر)، لە دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بابەتی دەتوانین کەڵکوەرگرین.

English Language – Programmed instruction

Railroods --- Accidents

**٥- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی گشتی( List of commonly used (subdivisions**

لە پێشەکی پێرستی سیرز، لیستی ئەلف و بێ دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی گشتی هاتووە کە رێگا بە پۆلێنکەر دەدات لەوانە بۆ تایبەت کردنی ئەو ناوونیشانە سەرەکییانە، کە مەبەستە کەڵکوەرگرێت. لەم لیستەدا، دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کە لە ژێری ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونە یا کلیلی هاتوون، دووپات نەکراوەتەوە. بەم پێیە پێویستە پۆلێنکەر بۆ رێنوێنی زۆرتر سەردانی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی ژێر ناوونیشانی غەیرە سەرەکی بابەتی نموونە کە مەبەستە بکات.

**ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونە یا کلیلی (Key Heading)**

ئەم ناوونیشانە سەرەکییانە لە پێشەکی پێرستی سیرزدا ناسێندراون و پۆلێنکەر دەتوانێ بۆ دروستکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی هاوشێوە سەردانی ناوونیشانە سەرەکییەکانی نموونەیی بکات.

ناوونیشانە سەرەکییەکان لە پێرستی سیرزدا بریتین لە:

| | |
|---|---|
| کەسایەتییەکان | Presidents--- United States |
| | Shakespeare, William, ١٥٦٤, ١٦١٦ |
| نەتەوەکان | Indians of North America |
| شوێنەکان | United State; Ohio; Chicago (III) |
| زمان و ئەدەبیات | English Language |
| | English Literature |
| شەڕەکان | World Ware; ١٩٣٩-١٩٤٥ |

**ئەو ناوونیشانە سەرەکییانەی کە لە پێرستی سیرزدا نەهاتوون، بەڵام پۆلێنکەر دەتوانێ بە سەرنجدان بە چەندین یاسا و ڕێسا ئەوانە دروستبکات:**

(Headings tobo added by the Cataloger)

لە پێشەکی پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی سیرز، لیستی چەندین گرووپ لە ناوە تایبەتییەکان (Praper names) و ناوەکانی گشتی (common name) هاتووە کە بەپێی ئەوانە و بەسەرنجدان بە یاسا و ڕێسا دەتوانین ناوەکانی تایبەتی (ناوی کەسەکان، تایفەکان، شت و مەك و ...) وەك ناوونیشانی سەرەکی بابەتی هەڵبژێرین.

**((پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسی))**



ئەم پێرستە پێشەکێیەکی چڕوپڕی هەیە، کە خوێندنەوەی بۆ پۆلێنکەران پێویستە، لەم پێشەکییەدا، کورتە مێژووی شێوەکار و شێوەیی ڕێکخستن و شیکردنەوەی تەواو سەبارەت بە کارکردەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکان هاتووە. بە تێکڕا بە هەمان شێوە کە پێشتر ئاماژەی پێکرا ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسی لەسەر بنەمایێکی هاوشێوەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە لیست کراون. لەم پێرستەدا، ناوونیشانە سەرەکییەکانی پەسەندکراو، بەواتایێکی دیکە ئەو ناوونیشانە سەرەکییانە کە پۆلێنکەر دەتوانێ بۆ بابەتدان بە کتێبەکان کەڵکی لێوەرگرێت، بەپیتی ڕەشتر و گەورەتر دیاریکراون و ناوونیشانەکانی هاوشێوە یا هاوتاکە پیشاندەری بابەتەکانی ئیرجاعین، بە پیتی باریکتر لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیاندا هاتوون و بە نیشانەی ((نك)) (تەماشا بکەن لە) بۆ ناوونیشانە سەرەکیەکانی پەسەندکراو ئیرجاع دەدات.

ئەو زانیارییانەی کە دراون لە بەرامبەر و لە ژێر هەر ناوونیشانێکی سەرەکی بریتین لە:

١- لە بەرامبەر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکاندا ((دابەشکردنی جوگرافیایی)) لە نێو دوو کەوان ( ) هاتووە، کە ڕێگا بە پۆلێنکەر دەدات ناوی شوێنی جوگرافیایی زیاد بکات بەو ناوونیشانە سەرەکییەی کە مەبەستییەتی.

جوگرافیایی مرۆڤایەتی (دابەشکردنی جوگرافیایی)
جوگرافیا (مرۆڤایەتی — هیند)
جوگرافیای مرۆڤایەتی — ئێران — خۆراسان

دوایی ئەوە، بەرامبەری ناوونیشانەکانی سەرەکی بە زمانی ئینگلیزی هاتوون، کە بەکەڵکوەرگرتن لە ناوونیشانەکانی پەسەندکراوی کۆنگرەن. نیشانەی ئەستێرە ((*)) لە تەنیشت هەندێك لە بەرامبەرەکانی ئینگلیزی ناوونیشانە سەرەکییەکاندا، پیشاندەری ئەوەیە کە دەستەواژەی مەبەست لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی کۆنگرەدا

نەهاتووە. یا بەرامبەرەکەی بوونی نییە، بەڵکو لە لایەن کتێبخانەی میللی ئێرانەوە نووسراوە.

تورکیە عوسمانی ※ouoman Empire

تەفسیری ئایات ※Hermaneutic of Ayat

**٣- یادداشتەکانی هاوپێچ:**

لە ژێر هەندێك ناونیشانە سەرەکییەکاندا و بە مەبەستی روونکردنەوەی چەمك و هاوپێچ کارکردنی ئەوانەشی کردنەوییێکی کورت هاتوون. لەم یادداشتانەدا، هەندێك جار بۆ پتر زانینی بابەتەکە، نموونەگەلێك نووسراون.

**رووناکی Lighting**

هەروەها بابەتی ((رووناکایی) لە ژێر ناوی شارەکاندا بنووسن. وەك: تاران — رووناکایی، هەروەها لە ژێر ناوی بابەتەکانی تایبەتدا وەك: کارخانەکان — رووناکایی.

لە هەندێك لە یادداشتەکاندا رێگادراوە کە ئەو ناونیشانە سەرەکییەی کە مەبەستە وەك دابەشکردنی غەیرە سەرەکیش کەڵکی لێ وەربگیردرێت.

**پەیکەرناسی Anetomy**

هەروەها بابەتی ((پەیکەرناسی)) لە ژێر بابەتە جۆراوجۆرەکاندا دابەشبکەن. وەك: ئاژەڵەکان — پەیکەرناسی، دەمارەکان — پەیکەرناسی. بۆ بوونەوەرە زیندووەکان ((پەیکەرناسی)) و بۆ رووەکەکان و بێ گیانەکان ((تەشریح)) بەکاربێنن.

بانکداری نێو دەوڵەتی

بانك و بانکداری نێودەوڵەتی

بانکداری ناوەندی

بانك و بانکداری ناوەندی

بانکی ناوەندی ئەمریکا Federal Reserve Banks



تەماشای یادداشتی ژێر ((بانك و بانکداری ناوەندی)) بکەن

فیدراڵ ریزر و بانك

بانکی ناوەندی بەریتانیا Bank of England

تەماشای یادداشتی ژێر ((بانك و بانکداری)) بکەن.

بانکی ئاونگلند.

### ٣- ئێرجاعەکان:

پاش لە یادداشتی هاوپێچ ئێرجاعەکانی بابەتی هاتوون کە چەشنەکانی بەم شێوەی خوارەوەن.

**ا) ئێرجاعی ((X)) (گەڕان لە):**

کە پێشاندەری ناوونیشانە سەرەکییەکانی هاوشێوە و هاوتایە. هەریەك لەم ئێرجاعانە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیان، بە پیتی باریکتر هاتوون و بە نیشانەی ((نك)) (تەماشا بکەن لە)، بە ناوونیشانی سەرەکی پەسەندکراوی خۆی ئێرجاع دەدات. ئاشکرایە، یەکەمین جار کە کتێبێك لە بابەتێکی تایبەتی پۆلێندەکرێت، پێویستە ئێرجاعەکانی بابەتی ئەو لەسەر کارێکی جیاواز بنووسرێت و لە ئیندێکسی بابەتێکدا جێ بگریت تا بەم شێوە خوێنەران لە بابەتە جۆراوجۆرەکان کە لە زەینیاندایە رێنوێنی بکرێن بو ئەو ناوونیشانە سەرەکییانە کە بەخەتی سوور لە سەرووی کارتی پۆلێنەوە تایپکراوە.

ژینگەناسی (دابەشکردنی جوگرافیایی)     Biology

X بایۆلۆژی

ژینگە

زانستی حەیات

ژینگەناسی (بە پیتی سوور دەنووسرێت)
حائید رۆحانی، عەلی
بایۆلۆژی گشتی/ نووسنیی حائیدی رۆحانی تاران: زانکۆ تاران، ٤٨
وێنەدار.- (چاپ و بلاوکردنەوە زانکۆ تاران
واژەنامە
کتێب نامە
١- ژینگەناسی ٢- باختەی ناسی الفە ناوونیشان

بایۆلۆژی
تەماشابکەن لە
ژینگەناسی



**ب) ئێرجاعی ((ن ن)) (هەروا تەماشا بکەن)**

لە پێرستی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسی، ناوونیشانە سەرەکییەکانی تایبەت لە ژێر ئەو ناوونیشانە سەرەکییانە کە مەبەستن بە نیشانەی ((ن ن)) دیاریکراون. هەر کام لەو ناوونیشانە سەرەکیانە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیان بە پیتی پڕ رەنگتر و وەك ناوونیشانی سەرەکی پەسەندکراوە.

**نموونە:**

خزمەتگوزارەییەکانی راگەیاندن

ن ن. ناوەندەکانی بەڵگەکان و بڕوانامەکان

دخانیات

ن ن. تەماکۆ

جگەرە

ئەگەر بوونی کتێبێك یا چەندین کتێب کە بابەتەکانیان نسبەت بە بابەتی ئەو کتێبەی کە پۆلێندەکرێت تایبەت یا هاوشێوە بن دەبێ کارتەکانی ئێرجاعی پێوەندیدار بە شێوەی خوارەوە ئامادەبکرێت لە ئیندێکسی بابەتیدا فایل بکرێت.

خزمەتگوزارییەکانی راگەیاندن
تەماشا بکەن لە:
ناوەندەکانی بەڵگەکان و بڕوانامەکان

ئەم جۆرە کارتە ئێرجاعییانە بە خوێنەر دەرفەت دەدەن، کە ئەگەر پێویستی زۆرتریان هەبوو بتوانن بە کتێبگەلێك دیکە کە بابەتەکانیان نسبەت بەو بابەتەی کە مەبەستە تایبەت یا هاوتابێت، دەستیان پێ بگات و کەڵکی لێوەرگرن. بەهەمان شێوە کە ئاماژەکرا، دروستکردنی کارتەکانی ئێرجاعی ((ن ن)) پەیوەستە بە بوونی کتێبگەلێك لەو بوارەدا لە کتێبخانە.

**ج) ئیرجاع ((XX)) (هەروەها بگەڕێن):**

لە ژێر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەكییەكاندا، چەندین ئیرجاع هاتووە، كە بە نیشانەی ((XX)) دیاریكراوە. ئەو ئیرجاعانە نسبەت بەو ناوونیشانە سەرەكییانە كە مەبەستی گشتیتر و هەمەلایەنەترن و لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیان بە پیتی گەورەتر هاتوون و پەسەندكراون. ئەو ناوونیشانە سەرەكییەی كە لە بەرامبەریدا نیشانەی ((XX)) هاتبێت، كاتێ كە لە شوێنی ئەلف و بێ خۆی وەك ناوونیشانی سەرەكی پەسەندكراو دێت، دەبێ خاوەنی هەمان ئیرجاع بێت كە بە نیشانەی ((ن ن)) دیاریكراوە و لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیدا هاتووە.

نموونە:

دەروونناسی ئاژەڵی
X ئاژەڵەكان — دەروونناسی
ن ن. ئاژەڵەكان — خوو و رەفتار
XX دەروونناسی هاوتایی — تەتبیقی

دەروونناسی تەتبیقی
X تەتبیقی، دەروونناسی
دەروونناسی هەڵسەنگاندن
ن ن. دەروونناسی ئاژەڵەكان

لێرەدا، ((ئاژەڵەكان — دەروونناسی)) ناوونیشانی سەرەكی گەرانەوە، ((ئاژەڵەكان — خوو و رەفتار)) ناوونیشانی سەرەكی تایبەت نسبەت بە ((دەروونناسی ئاژەڵی)) و ((دەروونناسی تەتبیقی)) نسبەت بە ((دەروونناسی ئاژەڵی)) ناوونیشانە سەرەكییەكانی گشتیترە. كارتی ئیرجاعی دوو ناوونیشانی سەرەكی كە مەبەستە، ئەگەر كتێب لە هەردوو بابەتەكە لە كتێبخانەدا هەبێت بە شێوەی خوارەوە ئامادە دەكرێت و لە ئیندێكسی، بابەتی فایل دەكرێت.



| |
|---|
| دەروونناسی هەروەها تەماشا بكەن لە:<br>دەروونناسی ئاژەڵی |

| |
|---|
| دەروونناسی ئاژەڵی<br>هەروەها تەماشا بكەن لە:<br>دەروونناسی تەتبیقی |

**د) ئیرجاعی ((م)) (ناوونیشانە سەرەكییەكانی پێوەندیدار):**

دەبێ سەرنج بدەین، لەوانەیە لە ژێر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەكییەكاندا، ناوونیشانی سەرەكی دیكە بە نیشانەی ((م)) هاتووە. ئەم ئیرجاعە بە نسبەت ناوونیشانە سەرەكییەكانی سەرەوەی خۆی هاوتایە یا لە رووی بابەتییەوە هاوبەهان. ئەم ناوونیشانە سەرەكیانە، ناوونیشانە سەرەكییەكانی پێوەندیداریان پێ دەڵێن:

خزمەتگوزارییەكانی راگەیاندن
X زانیارییەكان — خزمەتگوزارییەكان
ن ن. ناوەندەكانی بەڵگەكان و بڕوانامەكان
XX رایەڵەكانی راگەیاندن
م. خزمەتگوزارییەكان سەرچاوە
دكومانتاسیون

لە نموونەی سەرەوە، دەستەواژەی ((خزمەتگوازرییەكانی سەرچاوە)) و ((دكومانتاسیون)) نسبەت بە ناوونیشانە سەرەكییەكەی ((خزمەتگوزاری راگەیاندن)) تایبەت یا گشتی نییە، بەڵكو پێوەندی لەگەڵدا هەیە. ئەو كتێبانەی كە

ئەم بابەتانەیان لە خۆگرتووە، بە شێوەی بالقوە دەتوانین بۆ ئەو کارگێڕانەی کە بە شوێن ئەو بەرهەمانەوەن سەبارەت ((خزمەتگوزارییەکانی راگەیاندن)) بە کەڵکە.

جەبر و ئیختیار
X ئازادی ئیرادە
ئیختیار و جەبر
ن ن. ئیرادە
م. قەزا و قەدەر

قەزاو قەدەر
هەروەها تەماشا بکەن لە:
جەبر و ئیختیار

بەم شێوەیە، خوێنەر لەهەر بابەتێك بۆ بابەتێکی دیکە رێنوێنی دەکرێت تابتوانێ لە کتێبگەلێکی زۆرتر کەڵکوەرگرێت.

**چەشنەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکان لە رووی چێوەوە:**

هەرچەندە سادەترین چێوەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی، ناوونیشانە سەرەکییەکانی یەك واژە وەك ((ئاو)) ((پزیشکی))، ((دەروونناسی)) و لەو بابەتەن، بەڵام هەمیشە ناکرێت بابەتی کتێبەکان لە چێوە و قاڵبێکی سادە و یەك واژەی پیشانبدەین. کتێبی زۆر هەن، کە بابەتەکانیان لە چوارچێوەی چەند وشە یا بە شێوەی یەك رستە سادەتر و گویاترە. وەك ((دەروونناسی گەشەکردن))، ((چیرۆکەکانی زانستی فەرەنسی))، ((شارستانییەتی سەدەکانی بیست))، ((ئیسلام و پەروەردە و فێرکردن)) و هتد...



بەهەرحاڵ، پێویستە پۆلێنکەر لە کاتی دیاریکردنی بابەتی کتێب، ناوونیشانی سەرەکی یەك واژەی هەڵبژێرێت، تا رستەیەکی پێچەوانە و لەو بابەتانە. لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسیدا چێوەکانی ناوونیشانە سەرەکییەکان لە رووی شێوەوە بریتین لە:

**١- ناوونیشانە سەرەکییەکانی یەك واژەیی یا سادە (کۆ یا تاك).**

نموونە: کتێب، تراکتۆر، کوردستان، شیراز، هەوا، هەورەکان، سەگەکان، پزیشکی...

**٢- ناوونیشانی سەرەکی کە واژەی شیکەرەوەی هەیە.**

هەندێك جار پێویستە ناوونیشانێکی سەرەکی لە رووی چەمك و بواری کارکردییەوە، بە زیادکردنی واژە یا رستەیەکی شیکەرەوە لە نێو دوو کەوانە (  )، روونتر بکەینەوە. بۆ وێنە ئەگەر واتای ناوونیشانێکی سەرەکی بۆ خۆی نادیار بێت یا ناوونیشانێکی سەرەکی لە چەند بواردا جێگیربێت، یا چەند ناوونیشانی سەرەکی لە رووی نووسینەوە یەکسان بن، پێویستە واژە لەگەڵ رستەیەکی شیکەرەوە بە وانە زیاد بکرێت.

**نموونە:**

| | |
|---|---|
| حەرەکەت (فیزیا) | پێکهێنان (کتێبخانەکان) |
| حەرەکەت (مۆسیقا) | ژن هێنان (ئیسلام) |
| حەرەکەت (فەلسەفە) | ژن هێنان (زەردەشت) |
| یوگا (وەرزش) | گۆڕانکاری (زەویناسی) |
| یوگا (فەلسەفە) | |

**٣- ناوونیشانی سەرەکی کە پێکهاتووە لە ناو و خەسڵەت**

وەك: کتێبخانەکانی لادێ، کۆمەڵگای سەرەتایی، وزەی ئەتۆمی و ... ژمارەی ئەم جۆرە بابەتانە لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسیدا زۆرن.

**٤- ناوونیشانی سەرەکی پێچەوانە:**

لەم جۆرە ناوونیشانە سەرەکییانەدا کە لە دەرەوەی شێوەی سروشتی زمانە، واژەی گرنگتر بە مەبەستی جێگیربوون لە شوێنی ئەلف و بێ خۆی لە سەرەتاوە دێت و لە نێوان دوو بەشی ناوونیشانی سەرەکی هێمای کۆما (،) دادەنرێت. وەك:

ئاو، سەرچاوەکان، پیشەکان، دیاریکردنی شوێن، ئۆتومبێل، میکانیك، ڕێژەی

ئەم جۆرە ناوونیشانە سەرەکییانە لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسیدا، بە پێچەوانەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرە زۆر کەمن.

**٥- ناوونیشانە سەرەکییەکانی ڕستەیی**

هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییەکان بە شێوەی یەك ڕستە پێکهاتوون لە چەند ناو و خەسڵەت لەگەڵ پیتی پێوەندیدار یا زیادکراو دەبینرێت. وەك: سینەما لە پەروەردە و فێرکردن ئاو لە ئایینەکان و ئەدەبیاتی گشتی، کتێب و کەرەستەکانی خوێندن بۆ منداڵان.

**٦- ناوونیشانی سەرەکی پێکهاتوو لە چەندین بەش**

لە هەندێك شوێن لەوانەیە ناوونیشانی سەرەکی بابەتی پێکهاتبێت لە چەند بەش. ئەم ناوونیشانە سەرەکیانە زۆرجار لە ناوە تایبەتییەکان پێکدێن کە بەشەکانیان لەگەڵ نیشانەی خاڵ بە دوای یەکدا دێن.

- ناوی ڕێکخراوێك پاش لە ناوی وڵات یا دامەزراوەی سەرەکی ئێران.

**نموونە:** ئێران. ئەرتەش

ئێران. وەزارەتی فەرهەنگ و خوێندنی باڵا. ناوەندی زانیارییەکان و بەڵگەنامەکانی زانستی ئێران.

ڕێکخراوی لێکۆڵینەوەکانی خانووبەرە. نووسینگەی فەننی

**- بەشەکانی کتێبە پیرۆزەکان**

قورئان. فارسی — عەرەبی

قورئان. بەشی سێیەم

ئێڤستا. گاسەکان



کتێبەکان و بەرهەمی نووسەران کە لە پاش ناوی ئەوانەوە دێت

**نموونە:**

مەولەوی، جەلال الدین محەمەد بن حەمەد. مەسنەوی

مەولەوی، جەلال الدین محەمەد بن حەمەد. مەسنەوی — ڕەخنە و تەفسیر

مەولەوی، جەلال الدین محەمەد بن حەمەد. مەسنەوی — پیرچەنگی

**دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی لە ناوونیشانەکانی سەرەکی فارسیدا:**

لەم پێرستەشدا بۆ تایبەت کردنی ناوونیشانە سەرەکییەکان لە دابەشکردنی غەیرە سەرەکی کەڵك وەردەگیردرێت. بەم واتایە کە ناوونیشانێکی سەرەکی ئاشکرا دەکرێت لەگەڵ زیادکردنی دابەشکردنی غەیرە سەرەکی شیاو، تایبەت بکرێت و بەم شێوەیە ناوەڕۆکی کتێبەکە بە شێوەی تایبەت بە خوێنەران نیشانبدرێت. هەرچی کۆمەڵەی کتێبخانەکان تایبەتیترین یا ڕێژەی کتێبەکان و چاپەمەنی و بڵاوکراوەکان لە یەك بواردا زۆرترین. بایەخی دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی لە نیشاندانی بابەتە تایبەتییەکاندا ئاشکراتر دەبێت. بۆ نموونە: لە بوارەکانی وەك فیزیا یا کیمیا، سەدان کتێب چاپدەکرێت، کە هەریەك لە لایەنێکی تایبەتەوە دەڕوانێتە بابەتەکە، بە واتایێکی دیکە، دەتوانین بڵێین کە:

دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی لە بنەڕەتدا بە مەبەستی تایبەت کردنی بابەت و هەروەها بۆ پاراستنی پێوەندی لایەنە ناجیاوازەکانی یەك بابەت لەگەڵ خودی بابەت پێکهاتووە.

چەشنەکانی دابەشکردنی غەیرە سەرەکی لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی فارسیدا بریتین لە:

**١- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بابەتی یا بابەتی ژێر بابەت**

هەندێك جار بە زیادکردنی بابەتێك بەو ناوونیشانە سەرەکییەی کە مەبەستە، دەکرێت. ئەو تایبەت بکەین. وەك ئەوەی کە دەتوانین واژەی نەخۆشییەکان بە

نیشانەی تەقەڵ (-) بە ناوونیشانی سەرەکی پێوەندیدار بە ئەندامەکانی لەشەوە زیاد بکەین بەم شێوەی لایەنێکی تایبەت کە بابەتی گشتیتر پیشاندەدرێت.

**نموونەکان:**

دڵ — نەخۆشییەکان

گورچیلەکان — نەخۆشییەکان

گەنم — چاندن و بژارکردن

چەوەندەر — چاندن و چاکسازی

نەوت — پیشە و بازرگانی

مەودای خۆراکی — پیشە و بازرگانی

هەندێك جار لە ژێر هەندێك لە ناوونیشانە سەرەکییاندا یادداشتێك هاتووە، کە بە پۆلێنکەر رێگا دەدات ئەو ناوونیشانە سەرەکییەی کە بە شێوەی دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بابەتیش بەکاربێنێت.

**نموونە:**

Public Welfare ئاسایشی کۆمەڵایەتی (دابەشکردنی جوگرافیایی)

لێرەدا بەرهەمەکان سەبارەت بە... ئاسایشی کۆمەڵایەتی لە ژێر پێرستی تایبەتەکان و شوێنەکان بێنین وەك: شارەکان و شارۆچکەکان — ئاسایشی کۆمەڵایەتی، کار و کرێکاران — ئاسایشی کۆمەڵایەتی.

**٢- دابەشکردنی غەیرە سەرەکی یا مێژوویی:**

بۆ تایبەتکردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی لە رووی کاتییەوە. دەتوانین لە دابەشکردنەکانی غەیرە سەرەکی کاتییەوە کەڵکوەرگرین. بۆ وێنە دیوانی شیعرێك کە لە سەدەی هەشتەم هۆنراوەتەوە، بەم شێوە بابەت دەکرێت:

شیعری فارسی — سەدەی ٨

چەشنەکانی دابەشکردنی کاتی لە ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی فارسیدا بریتین لە:



**٢-١. دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بەپێی سەدە:**

**نموونەکان:**

ئێران — بارودۆخی کۆمەڵایەتی- سەدەی ١٣

فەلسەفەی ئیسلامی — سەدەی ١١

فەرەنسا — سیاسەت و حکوومەت — سەدەی ٢٠

**٢-٢. دابەشکردنی غەیرە سەرەکی بەپێی ساڵ**

**نموونە:**

ئێران —سیاسەت و حکوومەت — ١٣٢٠ — ١٣٥٧

هند — مێژوو — ١٥٠٠ — ١٧٦٥

**٢-٣. دابەشکردنی غەیرە سەرەکی مێژووی بەپێی دەورە(سەردەم)**

نموونە:

ئێران — مێژوو — پێش ئیسلام

ئێران — مێژوو — پاش ئیسلام

**٢-٤. دابەشکردنی غەیرە سەرەکی مێژوو بەشێك لە بابەت**

نموونە:

شەڕی هند و پاکستان، ١٩٧١

فەلسەفەی سەدەکانی بیست

### ٣- دابەشكردنی شێوەیی یا فۆرمی:

بۆ نیشاندانی شێوەی هێنانی كتێبەكان، دەتوانین لە دابەشكردنەكانی غەیرە سەرەكی فورمی كەڵكوەرگرین. بۆ نموونە: ئەگەر ناوەرۆكی بەرهەمێك بە شێوەی واژەنامەی (ئەلف و بێ) نووسرابێت، لەم حاڵەتەدا بە زیادكردنی دابەشكردنی غەیرە سەرەكی شیاو (وەك: واژەنامەكان) دەتوانین بە خوێنەران لە دۆزینەوەی ئەو واژەنامەی كە دەیانهەوێت یارمەتی بدەین.

**نموونە:**

كیمیا — واژەنامەكان

فیزیا — واژەنامەكان

دابەشكردنی غەیرە سەرەكی فۆرمی لە ناوونیشانە سەرەكییەكانی بابەتی فارسی لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیاندا هاتوون و لە ژێر ئەوانەدا یادداشتێك هەیە، كە چۆنیەتی كاركردنی ئەوانە دیاریدەكات.

دەستنامەكان، دەستوورنامەكان و لەو بابەتانە Handbooks. Manuals. ete

بە تەنیایی كاریان پێناكرێت. ئەوانە وەك دابەشكردنی غەیرە سەرەكی بۆ كتێبە سەرچاوەكان بەكاربێنین

هەندێك لە دابەشكردنەكانی غەیرە سەرەكی فۆرمی بریتین لە:

كتێبناسییەكان، ئەدەبیاتی مێرمنداڵان، بە زمانێكی سادە، ساڵنامەكان دەستنامەكان، واژەنامەكان، ڕێنماكان، دەستنامەكانی تاقیگە، بەڵگەنامەكان و بڕوانامەكان.

**نموونە:**

كیمیا — دەستنامەكانی تاقیگە

فەلسەفەی ئیسلامی — دەستەواژەكان و تەفسیرەكان

كشتوكاڵ — ساڵنامە

كتێب و كتێبخانە — كتێبناسی

ئەستێرەناسی — بە زمانی سادە

زانست — ئەدەبیاتی مێرمنداڵان



# بەشی پێنجەم

## دابینكردن و هەڵبژاردنی ناوونیشانە سەرەكییەكان بۆ بەناوبانگان و نووسەران

## (كەسانی ڕاستەقینە)

لە کاتی پۆلێنکردن، لەگەڵ ناوگەلێکی زۆر سەروکارمان هەیە، کە یا پێویستە وەك بەرهەمهێنەر (سەرشوناسە و شوناسەی زیادکراو) لەوانە ناوببردرێت، یا ئەوەی کە لەوانەیە ئەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت، کە سەبارەت بەو وانەوە نووسراوە و دەبێ ناوی ئەوان وەك بابەتی کتێب (شوناسەی بابەتی) لە کارتی پۆلێندا بنووسرێت. بە هەر شێوە، ناوی بەرهەمهێنەران (چ لە کەسانی راستەقینە وەك: نووسەر، وەرگێڕ، هەڵەچن، پێداچوونەوە و... یا کەسانی خاوەن ماف وەك رێکخراوەکان و دامەزراوەکان) دەبێ بە شێوەیەکی یەکدەست و هاوئەهانگ (uniform heading) هەڵبژێردرێن و بەکاربێن، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، یەکێك لە ئامانجەکانی پۆلینکردن ئەوەیە کە هەموو بەرهەمەکانی یەك نووسەر یا سەبارەت بە یەك کەس لە پێرست لە تەنیشت یەکتر جێبگرن تا دۆزینەوەی ئەوانە خێراتر و ئاسانتربێت. (رێساکانی بەشی ٢) ئەنگلو ئەمریکەن پەیوەستە بە هەڵبژاردنی شێوەی یەکدەست و دروستی ناوەکان).

لەوەتی کە لە هەندێك شوێن (بەتایبەت سەبارەت بە کتێبە کۆنەکان، هەروەها کتێبە وەرگێڕدراوەکان و بەرهەمی نووسەران بە ناوێکی دیکەوە). ناوی کەسان بە شێوەی جۆراوجۆر لە بەرهەمەکانیاندا یا لە سەرچاوەکانی دیکەدا دەنووسرێت، پێویستە هەمیشە چێوەیەکی جێگیر و دووپاتی لە ناوی ئەوانە هەڵبژێرین و بەکاری بێنین و لە چێوەکانی دیکەی ناو بەشێوەی پەسەندکراوی ئەوانە ئیرجاع بدەین.

بۆ وێنە، ناوی ((بو عەلی سینا)) پسپۆری بەناوبانگی ئێرانی تا ئێستا لەلایەن کەسانی جۆراوجۆرەوە یا لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکاندا بە شێوەکانی جیاوازی خوارەوە ئاماژەپێکراوە.

بو عەلی سینا، ئیبن سینا، ئەبو عەلی سینا، شیخ الرئیس، پورسینا.

هەربۆیە، پێویستە بەپێی رێسای یەکێك لە شێوەکانی سەرەوە وەك ((ئیبن سینا)) هەڵبژێرین و هەمیشە ئەوە بەکاربێنین و لە شێوەکانی دیکەی ئاسایی بەم شێوە ئیرجاع بدەین.

شێخ ئەلرەئیس
تەماشا بکەن لە:
ئیبن سینا، حوسێن کوڕی عەبدوڵلا، ٣٨٠- ٤٢٨ ك.

**نموونەیەکی دیکە:**

ناوی راستەقینەی مارك تواین (Mark Twain) نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی (ساموئل لنگهورن کلمنس)، بەڵام چۆن هەمیشە بەرهەمەکانی خۆی بە ناوی (مارك تواین) چاپکردووە، لەم حاڵەدا پێویستە کارتەکانی ئیرجاعی بە شێوەی خوارەوە دروستبکەین و بیانخەینە نێو ئیندێکسەوە.

کلمنس، ساموئل لنگهورن
تەماشا بکەن لە:
تواین، مارك، ١٨٣٥- ١٩١٠ بەناوبانگ

کەم کەم کە رێژەی کۆمەڵەی کتێبخانەکان زۆردەبن و ناوگەلێکی جۆراوجۆر بە پێرستی کتێبخانە زیاد دەکرێت، پێویستە کۆنترۆڵی زیاتر و وردتر لەسەر ناوەکانی بەرهەمهێنەران بەرێوەبچێت. بەم هۆیەوە، بەم دیاردەیە واتای ((کونترۆڵی بەڵگەدار)) پێدەگوترێت (Authority Control) کە گرنگی ئەوە لە پێرستەکانی کۆمپیوتەری زۆر باشترە. هەندێك جار نووسەرێك ناوی خۆی بە شێوەگەلێکی جۆراوجۆر لە



بەرهەمەکانی خۆیدا دێنێت. لە کورتە مێژووی پۆلێنکردن، یەکدەستکردنی ناوی بەرهەمهێنەران یەکێك لە سەرەتاترین بنەماکان بوو، کە لە پۆلێنکردندا کەوتە بەرچاو.

بەدرێژایی دوو سەدەی رابردوو کە ساڵانێك کە دەستیان داوەتە نووسینی بنەماکانی پۆلێنکردن، وەك پانیتسی، جوت، کارتر، و لوبتسکی لەسەر بنەمای یەکدەستی ناوەکان (uniform heading) پێداگری زۆریان کردووە.

بە شێوەیەکی گشتی ناوی هەر کەسێك دەبێ بە شێوەیەك بێت کە:

١- لە پێرست داوا کە یەك شوێن و لە تەنیشت یەکتردابن.

٢- تا ئەو جێگایە لە لواوە بە شێوەی جێگیر و هاوئاهەنگ بەکاربێت، تا دۆزینەوەی ئەوانە خێراتر ئاسانتربێت.

٣- خوێنەران هەمیشە بە شێوەی بەکارهاتووتر و جێگیرتر بە ناوی کەسێك ئاشنا دەبن تا لە گەڕانەوەکانی دوایی بە پێرست، لە ژێر هەمان ناودا بگەڕێن.

بەواتاییێکی دیکە، هەر بەرهەمهێنەرێك دەبێ ناوەکەی بە شێوەی یەکدەست هەڵبژێرێت و بەکاربردرێت تا دەستپێڕاگەیشتنی خوێنەران بە بەرهەمەکانی یا سەبارەت بەو بە ئاسانی جێبەجێ بکرێت.

**رێساکانی گشتی دابینکردنی ناوی سەلمێنراو (رێسای ٢٢,١ تا ٢٢,٢٨)**

ناوی کەسایەتییەکان لە رووی نەتەوایەتی و زمان، کەون یا نوێ و شێوەی بەکارهێنانی ئەوانە زۆرجاران جێگیر و دووپات نییە. بۆ نموونە، تا رابردوویێکی زۆر دووریش نە کەلکوەرگرتن لە نازناو بە شێوەی ئێستا ئاسایی و باونەبووە. لە زۆر شوێندا، کەسان خاوەنی جۆرەها نازناو، ناوی سیانی و ناوبانگ بوون و ناوی ئەوانە لە بەرهەمەکان و سەرچاوە جۆراوجۆرەکاندا بە شێوازی جۆراوجۆر تۆمارکراوە. بەم مەبەستە، لە پۆلێنکردن و لە کاتی نووسینی سەرشوناسە و شوناسەکانی زیادکراو یا کاتێك کە ناوی کەسان وەك بابەت دادەنرێت، بە رێسایێك پێویستی، هەیە کە

هەمیشە ناوی کەسان بە گرنگیدان بە ڕێساییێکی یەکدەست و جێگیر هەڵبژێرێت و لە شێوەکانی دیکە بە ناوی هەڵبژێردراو بەکارهاتوو یا ناوی بەڵگەدار ئیرجاع بدات ((پێرستی بەڵگەداری ناوەکانی بەناوبانگان و نووسەران)) یەکێك لە گرنگترین و باوەڕپی کراوترین سەرچاوەیە کە لە پێشەکییەکەیدا یاسا و ڕێسای دابینکردنی ناوی بەڵگەداری کەسان هاتووە. ئەم پێرستە کە جاروبار چەندین هاوپێچی پێ زیاد دەکرێت بریتییە لە لیستی ئەلف و بێ ناوی کەسان کە لەوەدا یەکێك لە شێوە جۆراوجۆرەکانی ناوی کەسان وەك ناوی بەڵگەدار هەڵبژێردراوە و بە پیتی پڕ ڕەنگتر دیاریکراوە لە شێوەکانی دیکەش بەناوی بەڵگەدار و پەسەندکراو ئیرجاع دراوە. لە خوارەوە ناوی بەڵگەداریش ئیرجاعەکانیان بە پیتی باریکتر و نیشانە ((X)) دیاریکراون.

**نموونە:** ئیبن سینا، حسین بن عبدالله، **٣٧٠-٤٣٨** ك. م

X ئەبوو عەلی سینا

X بوعەلی سینا

X شیخ الرئیس

تواین، مارك، **١٨٣٥-١٩١٠**، بەکارهاتوو

X کلینس، ساموئل نگهورن

X مارك تواین

پێشەکی ئەم پێرستە، بەهەمان شێوە کە ئاماژەی پێکرا، بریتییە لە یاسا و ڕێسایێك سەبارەت بە دابینکردنی ناوی بەڵگەدار کە گرنگترین بابەتەکانی بە شێوەی کورت بریتین لە: بەتێکڕا لە زۆربەی شوێنەکاند، سەرەتا نازناو و پاش لە نیشانەی کۆما (،) ناوی چکۆلە و ئەگەریش بکرێت ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مردنی دەنووسرێت (ڕێسای ٢٢,٥).

**نموونە:**

ئەسفەندیاری، مورتەزا



زەرین کوب، عەبدولحسین، ١٣٠١-١٣٧٨

تۆلستۆی و الکس نیکا لایویچ، **١٨٨٢-١٩٤٥**

تۆلستۆی، لی یف نیکا لایویچ، **١٨٢٨-١٩١٠**

ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مەرگ: ئەگەر بکرێت پێویستە ساڵی لە دایکبوو و ساڵی مەرگ بە ناوی کەسانی زیاد بکرێت (ڕێسای ٢٢,١٩) مەبەست لەم کارە بە دەستدانی زانیاری سەبارەت بە دەورانی ژیانی کەسانە. لەبەر ئەوەی هەم زانیاری خوێنەران سەبارەت بە بەناوبانگان و نووسەران زۆر دەبێت و هەمیش لەگەڵ ئاگابووندا لە کات و دەورانی ژیانی نووسەرێك تا ڕادەیەك دەتوانین سەبارەت بە چۆنیەتی بەرهەمەکەی زانیاری بە دەستبێنین.

مەبەستێکی دیکە جیاوازی دانان لە نێوان ئەو بەرهەمهێنەرانەیە کە نازناو و ناوی چکۆڵەیان وەك یەکە.

بۆ زیادکردنی ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مەرگ یا یەکێك لەم دووانە بە ناوی کەسان، سەرەتا دەبێ ئەو زانیاریانە لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو یا لە خودی کتێبەکە بدۆزینەوە، پاشان دوای ناوی چکۆلە نیشانەی کۆما (،) دوایش ساڵی لە دایکبوون تەقەڵ (-)، ساڵی مەرگ و لە کۆتاییدا نیشانەی خاڵ (.) دابنێن.

**نموونە:**

فازل، جەواد، **١٢٩٣-١٣٤٠**.

مەولەوی، جەلال الدین محەمەد بن محەمەد، ٦٠٤-٦٧٤ ك. م.

دوما، ئەلکساندر، **١٨٠٢-١٨٧٠**.

ئەگەر هەرکام لە ساڵەکانی لە دایکبوون یا مەرگ لە بەردەستدا نەبن، لە شوێنەکەیدا بۆشایی دابنێن. ئەگەر لە هەرکامیاندا شك و گومان هەبوو، ئەوەی بە نیشانەی پرسیار دیاریبکەن.

**نموونە:**

سعدی، مصلح بن عبدالله، -٦٩١؟ ك. م.

زەرین کوب شیرازی، احمد بن ابی الخیر، ٦٧٠؟ — ٧٨٩ ک. م.

حافز ابرو، عبدالله بن لطف الله، ٦٧٣؟ — ٨٣٤ ک. م.

بەتێکڕا بۆ نووسەرانی ئێرانی، عەرەب و ئەفغانی پێش لە سەدەی ١٤ی کۆچی مانگی، ساڵەکان بە ساڵی کۆچی مانگی بە نیشانەی (ک. م) بنووسن. بۆ ئێرانییەکان و ئەفغانییەکانی هاوچەرخ، ساڵی خۆری (بەبێ هیچ نیشانەیەك) بۆ نووسەرانی دیکەش و بە ناوبانگانی هاوچەرخ (عەرەبی، ڕۆژهەڵاتی و لەوانە) ساڵەکان بە ساڵی زایین (بەبێ هیچ نیشانەیەك) بنووسن. ئەگەر لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا نەیانتوانی ناو و ساڵی لە دایکبوون و مەرگی نووسەران بدۆزنەوە، دەتوانن سەردانی سەرگوزەشت نامەکان، ئینسکلۆپیدیاکان و سەرچاوەکانی دیکە کە لە بەشی ((گەڕان بە دوای زانیارییەکانی کتێبناسی)) ئاماژەپێکرا، بکەن و بیاندۆزنەوە، ئەگەر ساڵەکانی ڕاستەقینەی لە دایکبوون و مردن نەدۆززرێنەوە، بەڵام سنوور یا سەدەپێوەندیدار دیاربێت، سەدەکە بەجێ ساڵی لە دایك بوون و مەرگ بنووسن.

**نموونە:**

ابراهیم بن نونجت، سەدەی ٤ ک. م.

تئودسیوس، سەدەی یەکەم پێش زایین.

پرتو اصفهانی، علی رضا محمد علی، سەدەی ١٣ ک. م.

هەموو لە قەبەکان، ناونیشانەکان، بەرپرسیایەتەکان و بەشە زیادییەکان وەك دوکتۆر و ئەندازیار، ئاغا، حەزرەت، ئەمیر، سەید، شێخ و حاجی و ... لە ناوەکان دەسڕێنەوە مەگەر لەقەبەکان و لەو بابەتانە بەشێکی جیانەبوو لە ناوبن، وەك مەلا مەحللی، ئاقا بوزورك تارانی، سید صادق...

بە تێکڕا بەناوبانگترین ناوی کەس یا بەکارهاتووترین شێوەی ناوی ئەو کەسە کە بەناوی ئەسمهەر بە ناوبانگە، وەك ناوی بەڵگەدار هەڵبژێردراوە و لە شێوەکانی دیکە



بەوە ئێرجاع دەدرێت (ڕێسای A٢٢,٣) ئەم کارە بە تایبەت سەبارەت بە ناوە لە مێژینەکان بەرچاو دەکەوێت.

**نموونە:**

ابن سعد محمد بن سعد، ١٦٨-٢٣٠ ک. م.

X ابن سعد الزهدی، ابو عبدالله محمد بن سعد

ابن سعد الواقدی

الزهدی، محمد بن سعد

کاتب الواقدی

الواقدی، محمد بن سعد

سەبارەت بەو کەسانە کە خاوەنی ناوی مستەعار یا تخلسن یا ناوێکی نووسەری تایبەتیان هەیە، ئەگەر بەرهەمەکانی خۆیان هەمیشە بە ناوی بەکارهاتوو یا تخلس چاپ و بڵاودەکەنەوە، دەبێ هەر ئەو ناوانە لەگەڵ نووسینی واژە ((مستعار)) وەك ناوی بەڵگەدار هەڵبژێرین و لە ناوی ڕاستەقینە بە وانە ئێرجاع بدرێت (ڕێسای ٢٢,٢٨).

**نموونە:**

((نیما یوشیخ)) کە ناوی ڕاستەقینەی ناوبراو ((عەلی ئەسفەندیارییە))

نیما یوشیخ، ١٢٧٤-١٣٣٨، مستعار

X اسفندیاری، علی

یوشیخ، نیما

کارتە ئێرجاعییەکانی ناوی سەرەوە بەم شێوە دروستدەکرێت.

ئەسفەندەری، عەلی
تەماشا بکەن لە:
نیما یوشیج، ١٢٧٤- ١٣٣٨، مستعار

یوشیخ، نیما
تەماشا بکەن لە:
نیما یوشیخ، ١٢٧٤- ١٣٣٨، مستعار

بەڵام ئەگەر کەسێك تەنیا هەندێك لە بەرهەمەکانی خۆیی بە ناوی مستەعارەوە چاپ و بڵاو بکاتەوە لەم حاڵەتەدا ناوی راستەقینەی ناوبراو وەك سەلمێنراو هەڵدەبژێرێت و لە شێوە یا شێوەکانی مستەعار بەو ئیرجاع دەدرێت.

**نموونە:**

شاملو، ئەحمەد، ١٣٠٤-
X أ، بامداد
بامداد، ئەلف
بەیانی، أ.

ناوی پێغەمبەران، ئیمامەکان، قەدیسەکان، پاپاکان و لەو بابەتانە: سەبارەت بە پێغەمبەران سەرەتا دەبێ ناوی چکۆلە و پاش لە نیشانەی کۆما (،) وشەی ((پێغەمبەر)) لەگەڵ دین یا رێبازی پێوەندیدار بنووسرێت و لە کۆتاییدا ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مەرگ زیاد بکرێت.

**نموونە:**

محەمەد، پێغەمبەری ئیسلام، **٥٣** پێش کۆچ — ١١ ک. م.



زەردەشت، پێغەمبەری ئێرانی
مووسا، پێغەمبەری یەهوود
ئەلبەت ناوی حەزرەتی عیسا و حەزرەتی ئیبراهیم بەتایبەتی بەم شێوە دەنووسرێن
عیسا ئیبراهیم        ئیبراهیم پێغەمبەر

سەبارەت بە ئیمامەکان و سەرەتا ناوی چکۆڵە و پاشان ناوی باوك و دوایش وشەی ئیمامی یەکەم و دووهەم... و لە کۆتایشدا ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مەرگ دەنووسرێت.

**نموونە**

عەلی بن ابی طالب، ئیمامی یەکەم، **٣٣** پێش لە کۆچ — ٤٠ ك. م.
حسین بن علی، ئیمامی سێهەم، ٦- ٦١ ك. م.

سەبارەت بە ناوە پیرۆزەکانی ئیسلام سەرەتا ناوی چکۆلە، پاشانیش ناوی باوك و لە کۆتایشدا ساڵی لە دایك بوون و مەرگ دەنووسرێت.

**نموونە:**

زینب، بنت علی بن أبی طالب،   -٦٢ ك. م.

سەبارەت بە ژنانی پیرۆزی ئیسلام سەرەتا ناوی چکۆڵە، دوایی ناوی باوك و لە کۆتایشدا ساڵی لە دایکبوون دەنووسرێت، ئەلبەت چەندین تایبەتمەندیش هەیە. وەك
فاطمە زهرا، ١٨ پێش لە کۆچ، - ١١ کۆچی مانگی.
ناوی پاپاکان و قەدیسەکانیش بە هەمان شێوە دەنووسرێت لە (رێسای ٢٢,١٣)
ژان پل دووهەم، پاپا        فرانسیس، قەدیس

شارەکان و فەرمانڕەوایان، بەرپرسانی سەڵتەنەتی و حکوومەتی: لەم بارەیەوە، سەرەتا ناوی چکۆڵە، پاشان رەچەلەك یا بنەماڵە و ئەو کات وشەیەك کە پێشاندەری پلە و پایەبێت، دەنووسرێت (رێسای ٢٢,١٦F٢٢,٥-A).

**نموونە:**

یەعقوبی لەیسی سەفەوی، شای ئێران، ٢٤٧-٢٦٥ ك. م.

عەباس سەفەوی یەکەم، شای ئێران، ٩٩٦-٣٨,١ ك. م.

عەباس میرزا قاجار، شاپوری ئێران، ٣,١٢- ١٢٤٩ ك. م.

مەهد عولیا، مەکە، هاوسەری محەمەد قاجار، شای ئێران، ١٢٢٠-١٢٩٠ ك. م.

سەعد بن زەنگی، ئەتابەك فارس

سەبارەت بە سەرۆك کۆمارەکان، سەرەتا نازناو و دوایش ناوی چکۆڵە و لە کۆتایشدا رستە ((سەرۆك کۆمار))، هەورەها ناوی ئەو وڵاتە پێ زیاد دەکرێت.

**نموونە:**

خاتەمی، محەمەد، سەرۆك کۆماری ئێران

کارتر، جیمی، سەرۆك کۆماری ئەمریکا

هاشمی رەفسەنجانی، ئەکبەر، سەرۆك کۆماری ئێران.

ژنانی هاوسەردار: ژنانی هاوسەرداری رۆژئاوایی لە ژێرناوی هاوسەرەکانیان دەناسرێن و نازناوی خۆیان دوای ناوی چکۆڵە یان لە نێو دوو (  )دا دێت.

**نموونە:**

گرسمن، جین (شیك)، ١٨٩٤-

X شیك، جین، (گرسمن)

X گرسمن، جین (شیك)

بەڵام ژنانی هاوسەرداری ئێرانی بە نازناوی خۆیانەوە دەنووسرێن و ناوی هاوسەرەکەیان ئەگەر پێویست بو لە نێو دووکەوانە (  ) دەنووسین.

ئەنساری، نوش ئافەرین (موحەقق)، ١٣١٨ —

X موحەقق، نوش ئافەرین، (ئەنساری).



**ناوە ئێرانییەکان: بۆ دیاریکردن و نووسینی ناوی ئێرانییەکان، ناچارم بەو دابەشکردنەی خوارەوە:**

أ) دەورانی پێش ئیسلام

لەم دەورەدا، ناوی ئێرانییەکان یا تەك عونسوریيە وەك زەردەشت، ارداویراف، یا لە هەندێك شوێندا ناوی باوکیش بەناوی کەسەوە زیاد دەکرێت، وەك: ئەردەشێر بابەکان، خوسرەو قوبادگان، یا لەگەڵ لەقەبدا دێت، وەك: شاپور ذوالاکتاف، خسرەوە و ئەنووشیروان، بەهرام کوژ ناوی ئێرانییەکانی پێش ئیسلام بەهەمان شێوە هەڵدەبژێرین و بەکاردێن.

ب) پاش لە ئیسلام تا سەرەتای سەدەی ١٤ ك. م.

لەم دەورانەدا، ناوی کەسان بە شێوەی جۆراوجۆر لە سەرچاوەکاندا نووسراوە، لە زۆر شوێندا لەقەب، کونیە، تەخەلوس لەگەڵ ناودا دەبیندرێن. بە شێوەیەك کە تەنانەت بوونەتە بەشێك لە ناوەکە و زۆرتر بەو لەقەبە ناسراون. لەم حاڵەتانەدا ناوی (شهر) وەك ناوی پەسەندکراو دێت، وەك: ((ابن سینا، حسین بن عبدالله، لە هەندێك شوێندا لەوانەیە ناوی (اشهرە)، ناوی چکۆڵەی کەس بێت وەك: ((ناسر خسرەو)) و ((حەسەن سەباح)) هەندێك جاریش لەوانەیە ناوی کەس بە کونیە و لەقەب. دەستپێدەکات. وەك ((ابو ریحان بیرون)) و ((ابو نصر فارابی)) هەندێك جاریش لەوانەیە ناوی کەس بە ناوی چکۆڵە و ناوی باوك دەستپێبکات. وەك: محەمەد بن عباد، ٤٣١-٤٨٨ ك. م.

ج) لە ساڵی ١٣٠٤ ك. خ بەم لاوە.

لەم دەورەدا بە هۆی یاسایی پێناسەوە، بوونی نازناو پێویست بوو، شێوەی ناوەکان گۆڕدراو سەرەتا نازناویشی ناوی چکۆڵە وەك ناوی بەڵگەدار هەڵبژێردرا.

حربی، عەباس    زەرین کوب، عبدالحسین

لە زۆر شوێندا نازناو لەگەڵ ناوی چکۆڵە زیاتر لە یەك بەش پێکدێن.

حسین یزدی، علی    بزرگ امید، ابو الحسن اقا بزرگ تهرانی، محەمەد حسن

**ناوی نووسەران و بەناوبانگەکانی عەرەب و موسڵمان:**

کە بە دوو دەورە دابەشدەکرێت

١- تا سەدەی ١٨ی زایینی: ناوی بەڵگەداری هەموو نووسەران و بەناوبانگانی ئەم دەورەیە وەك ناوی کەسانی ئێرانی تاسەرەتای سەدەی ١٤ ك. م. دیاریدەکرێن و هەڵدەبژێردرێن: واتا ناوی (اشهر) لەگەڵ ناوی چکۆڵە و ناوی باوك وەك ناوی بەڵگەدار هەڵدەبژێرین. هەروەها ساڵی لە دایکبوون و ساڵی مەرگیش بە ساڵی کۆچی مانگی دەنووسین.

**نموونە:**

حاجی خلیفە، مصطفی بن عبدالله، ١٠٠٤ — ١٠٦٧ ك.م.

ابن ادم، یحیی بن ادم، -٢٠٣ ك.م.

بشار بن برد، ٩٥ ؟ - ١٦٧؟ ك. م.

**٢- دەورانی هاوچەرخ:**

جۆراوجۆری ناوەکانی ئەم دەورەیە زۆرە، بەڵام بە تێکڕا سەرەتا نازناو و پاشان ناوی چکۆڵە دەنوسین.

حسین طه      قطب، سید

ناوی چکۆلەی زۆربەی عەرەبەکان لە دوو بەش پێکهاتووە، کە نابێ لەگەڵ نازناو بەکاری بێنین.

رشاد، محمد کامل القرشی، باقر شریف   صدر، محمد باقر   الحسینی، هاشم معروف

**٥- ناوە رۆژئاواییەکان:** زۆربەی ئەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەکاندایە. کتێبگەلێکن کە لە زمانی رۆژئاوایی (ئینگلیزی — فەرەنسا، ئەڵمانی، ئیتاڵی و ...) وەرگێردراونەتەوە.

بۆ وەرگێڕانی کتێبەکان و وەرگێڕانی ناوی نووسەران و بەناوبانگانی رۆژئاوا بە فارسی، یاسا و رێساییکی تایبەت لە گۆڕێدانییە و هەر وەرگێڕێك بەپێی زەوق و



سەلیقەی خۆی ناوەکانی رۆژئاوایی وەردەگێڕێتەوە و سەر زمانی فارسی، بەم هۆیە لەوانەیە یەك ناو لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی فارسیدا بە شێوە جۆراوجۆر بنووسین وەك ((Einstein)) پسپۆڕی بەناوبانگ تا ئێستا بە شێوەی جۆراوجۆر وەکو ((انشتن)) ((انیشتاین))، ((اینستین)) و ((اینستاین)) لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکاندا وەرگێڕدراوەتەوە، یا ئێرانناسی بە ناوبانگ ((Henry Carbin)) بە شێوەی ((هنری کوربین))، ((هانری کوربن)) و ((هانری کربن)) لە دەقە جۆراوجۆرەکاندا هاتووە لە پۆلێنکردندا، نووسینی ناوەکانی رۆژئاوایی بەهەمان شێوە کە وەرگێڕانی ئێرانی لە بەرهەمەکانی خۆیاندا هێناویانە، بۆتە هۆی جیاوازی و دووپاتەکاری و لەوانەیە بووبێتە هۆی جیابوونەوەی بەرهەمەکانی نووسەرێك لە یەکتر، هەر بۆیە پێویستە بە مەبەستی یەکدەستی و هاوئاهەنگی لەم بارەیەوە دەبێ یاسا و رسیاییێکی لەبەرچاو بگیردرێت. بە تێکڕا ناوە ئەوروپاییەکان دەبێ سەرنجدان بە تایبەتمەندییەکانی زمانی خودی ئەوانە، وەربگێڕدرێتەوە نموونە: ناوی ((Henry)) لە زمانی ئینگلیزی ((هنری)) لە زمانی فەرەنسی ((هانری)) یا ناوی ((Henry corbin)) بەسەرنج دان بەوەی کە لە رووی نەتەوایەتییەوە فەرەنسییە بە شێوەی دروست ((هانری کوربەن)) وەردەگێڕدرێت. بە هەر شێوە، نووسینی دروستی ناوەکانی رۆژئاوایی لە پێشبینەی پۆلێنکردن، دەبێ کەلکوەرگرتن لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان جێبەجێ بکرێت سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان بریتین لە:

١- پێرستی بەڵگەداری ناوەکانی بەناوبانگان و نووسەران ((لەگەڵ هاوپێچەکانی)

٢- کتێبناسی میللی ئێران (دەورەی نوێ ١٣٦٢ - )

٣- Universal Pronoucing Dictionary of Biography and Mythology

ئەم سەرچاوەیە، ئامێرێکە کە ناوی نووسەران و بەناوبانگان بە گرنگیدان بە نەتەوەیی و تایبەتمەندییەکانی زمانی ئەوانە و بە کەلکوەرگرتن لە رێساکانی فۆنیتیك دەنووسرێن. بۆ نموونە ناوگەلێك ((جۆرج)) یا ((جرج)) ئینگلیزی، ((ژرژ)) فەرەنسی،

((گئورگ)) ئەڵمانی، ((گئورگی)) روسی، ((خورخە)) یا ((خورقە)) (ئەمریکا لاتین) هەموویان بە کەمێك جیاوازییەوە لە واژەی Georg پێکهاتوون بەڵام لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا بە شێوەی جیاواز دەنووسرێ.

٤- NUC (پێرستگانی میللی ئەمریکا)

٥- سەرگوزەشت نامەکانی باوەڕپێکراو (فارسی، غەیرە فارسی).

٦- Pseudonyms and Nicknames Dictionary

پێداچوونەوەی سێهەمی ئەم بەرهەمە لە دوو بەرگدا لە ساڵی ۱۹۸۷ چاپکراوەتەوە و بریتییە لە ۸۰ هەزار ناوی بەکارهاتوو و لە قەبەکانیان کە ئیرجاع دەدات بە ناوی سەرەکی.



# بەشی شەشەم

دابینکردن و هەڵبژاردنی ناوونیشانە سەرەکییەکانی ناو بۆ رێکخراوەکان و دامەزراوەکان. وەك بەناوبانگان و نووسەران، ناوی رێکخراوەکان و دامەزراوەکانیش لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکان یا لە دەورە جیاجیاکاندا بە شێوەی جیاواز نووسراون. لەم بارەیەوە چ ناوی رێکخراوەك سەر شوناسە هاتبێت و چ وەك بابەتی کتێب (شوناسەی بابەتی)، پێویستە کە ئەو ناوە بە کەلکوەرگرتن لە سەرچاوەکانی باوەڕپێکراو بە شێوەی دووپات و هاوئاهەنگ لە پێرستدا بنووسرێت. گرنگی ئەو کارە زۆرتر بەو هۆیە دەبێت کە ناوی رێکخراوەکان بە درێژایی زەمان تووشی گۆڕانکاری زۆر دەبێت. هەندێك لە رێکخراوەکان ناوی خۆیان بە چەندین هۆ کۆڕییەوە ((پێرستی بەڵگەداری ناوی دامەزراوەکان و رێکخراوەکانی حکوومەتی ئێران)) کە پێداچوونەوەی یەکەمی لە ساڵی ١٣٥٦ و پێداچوونەوەی دووهەمی لە ساڵی ١٣٦٨ چاپ و بڵاوکراوەتەوە، سەرچاوەیەکە کە زانیارییە پێویستەکان سەبارەت بە رێکخراوەکانی حکوومەتی ئێران دەخاتە بەردەست پۆلێنکەرانەوە. لەم بەرهەمەدا، ناوی رێکخراوەکان بە شێوەی ئەلف و بێ ئامادەکراوە و سەبارەت بەهەر رێکخراوێك سەرەڕای ئاماژە بە کورتە مێژووی دامەزراندنی، زانیاریی سەبارەت بە گۆڕانکارییەکان هاتوون.

# بەشی حەوتەم

کورتەیەك لە ڕێساکانی دابینکردنی سەرشوناسە و شوناسەکانی زیادکراو ڕێساکانی پۆلێنکردنی ئەنگلو ئەمریکەن، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو جۆرەکانی مەوادی کتێبخانە لە خۆدەگرێت، بریتییە لە شێوازە جۆراوجۆرەکان و خاڵە تایبەتییەکان کە هەندێك لەوانە لەگەڵ تایبەتمەندییەکان و پێناسەکانی کتێبناسی کتێبە فارسییەکان یەك ناگرنەوە. لەم ڕووەوە، پێویستە زۆرتر لەگەڵ ئەو ڕێسایانە کە سەبارەت بە بەرهەمە فارسییەکانن ئاشنابین. بەشی ٢١ لە پێداچوونەوەی دووهەم ڕێساکانی ئەنگلو ئەمریکەن بە ناوونیشانی ((هەڵبژاردنی شوێنەکانی دۆزینەوە)) بریتییە لە ڕێساکانی تایبەتی دابینکردنی شوناسە و شوناسە زیادکراوەکان. پێرستی دەقی ئەم بەشە کە بەچڕ و پڕی لەو بەرهەمەدا هاتووە. دەتوانێت چارەساز بێت بۆ پۆلێنکەران لە دۆزینەوەی ئەو ڕێسایانەی کە پێویستییانە. هەروەها پێرستی کۆتایی ئەم بەرهەمە ئامرازێکە بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێسایانەی کە زۆر تایبەتن سەبارەت بە حاڵەتە تایبەتییەکانی بەرهەمەکان.

لێرەدا تەنیا ئاماژە بەو ڕێسایانە دەکەین کە زۆر گشتین و کارکردنیان تەنیا سەبارەت بە کتێبە فارسییەکان.

**١- ئەو بەرهەمانەی کە خاوەنی نووسەرێکی تایبەتن (ڕێسای A٢٢,١)**

بەرهەمێك کە لە لایەك تا سێ کەسەوە نووسراوە، لە ژێر ناوی نووسەری یەکەم دەنووسرێت، سەبارەت بەو بەرهەمانە کە لە لایەن چەند کەسەوە و بە شێوەی هاوبەش دەنووسرێن وەك دوو یای نووسەر ڕێسای ٢١,٦ لەبەرچاو دەگیرێت.

لەم بارەیەوە ناوی یەکەمین کەس لە سەرچاوەی سەرەکی زانیارییەکان (وەك لاپەڕەی ناوونیشان) دەکرێت بە سەرشوناسە و یەك یا دوو کەسی دیکەش، هەروەها بۆ ناوونیشانی بەرهەمەکە، شوناسەی زیادکراو ڕەچاو دەکرێن.



عەزیمی، سیروس
بنەماکانی دەروونناسی گشتی/ سیروس عەزیمی

ئەمیر موعیز، عەلی ڕەزا
جەبری خەتی/ نووسینی عەلی ڕەزا موعیز، ئەلسوداس کارشناس

سەبارەت بەو بەرهەمانەی کە بە شێوەی تێکەڵ لە لایەن بەرهەمهێنەرانێکەوە بەرپرسایەتی جیاوازیان هەیە (وەك نووسەر و وەرگێڕ، لەگەڵ نووسەر و وێنەکێش) ئامادە کراو بەرهەمەکە ببەنە ژێر ناوی بەرهەمهێنەری سەرەکی (وەك نووسەر) و بۆ کەسی دیکەش (وەکو وەرگێڕ، وێنەکێش) شوناسەی زیادکراو ڕەچاو بکەن. (ڕێسای ٢١,٨ ، ٢١,٢٨).

ئۆلسوالد، یان
خەو/ نووسینی یان ئۆلسوالد. وەرگێڕانی محەمەد ڕەزا باتنی
١. بابەت الف. باتنی محەمەد ڕەزا ، وەرگێڕ

خەلیل، عەزیم
ماسیگر و دەریا/ نووسینی عەزیم خەلیلی، وێنەکێش نەیرە تەقەوی
الف. تەقەوی، نەیرە، وێنەکێش

سەعدی، موسلّح کوڕی عەبدوڵڵا
گوڵستان/ بەرهەمی موسلّح ئەلدین  سەعد شیرازی.
هەڵەچن و توێژینەوە عەلی موحسین یوسفی
١. بابەت الف. یوسفی، عەلی موحسین، هەڵەچن

**٢- ئەو بەرهەمانەی کە نووسەرەکانیان ڕێکخراوەکانن (ڕێسای B٢١,١)**

ئەو بەرهەمە کە لە لایەن ڕێکخراوێك یا دامەزراوییێك نووسراوە (وەك ڕاپۆرتەکانی حکوومەتی و هتد...) لە ژێر ناوی ڕێکخراو یا دامەزراودا دەنووسرێت.

دامەزراوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوکانی بازرگانی
ئێران: وێنەی ئاماری بازرگانی دەرەوە ٦٠- ١٣٥١

ئێران وەزارەتی کشتوکاڵ. جێگری پلاندانان و بەرنامە
ئاکامی لێکۆڵینەوەکان و گەڵاڵەکانی کشتوکاڵی وەزارەتی
کشتوکاڵ لە ماوەی دەساڵی ڕابردوو

سەبارەت بەو بەرهەمانە کە بە شێوەی هاوبەش لە لایەن دوو یا سێ ڕێکخراوەوە ئامادە دەکرێت، ڕێسای ٢١,٦ و ئەو بەرهەمانە کە بە هاوکاری دوو یا سێ ڕێکخراو بە شێوەی تێکەڵ نووسراوە، ڕێسای ٢١,٨, ٢١,٧ ڕەچاوبکرێن. لەم حاڵەتەدا ناوی یەکەمین ڕێکخراو دەکرێتە سەر شوناسە و بۆتەنگانەکانی دیکەش شوناسەی زیادکراو دروستدەکەین.



ناوەند و ئاماری ئێران
گەڵاڵەی ئامارگرتنی سەرانسەری کشتوکاڵ/ ناوەندی ئاماری ئێران،
بە هاوکاری وەزارەتی کشتوکاڵ

ڕێکخراوی بەرنامە و بودجە. جێگری فەننی
پرۆژەی نووسینی ستانداردەکانی فەننی بۆ دەزگاکانی ئیمەنی
جێگیری فەننی ڕێکخراوی بەرنامە و بودجە. ڕەسمەکان و نەخشەکان
لە دامەزراوە ستاندارد و لێکۆڵینەوەکانی پیشەی ئێران.
١. بابەت الف. دامەزراوە ستاندارد و لێکۆڵینەوەی پیشەی ئێران

**٣- حاڵەتەکانی تایبەتی بۆ بەرهەمهێنەر:**

سەبارەت بە دوو ڕێساکانی گشتی پێشتر دەبێ لەبەرچاوبگرین کە مەبەست لە بەرهەمهێنەر تەنیا نووسەر نییە، بەڵکو هەر کەس یا ڕێکخراوێك لە بە شێوەیەك نەخشی سەرەکی لەبەرهەمهێنانی بەرهەمێکدا بوون، وەك وێنەکێش، بۆ ئامادەکردنی کۆمەڵێك لە وێنەکان جا ڕەسم کێش، بۆ ئامادەکردنی کۆمەڵێك ڕەسم، کۆکەرەوە بۆ کۆکردنەوە و چاپ و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك لە وتارەکان یا بەرهەمە جیاوازەکان و هتد....

کەسرائیان، نەسرەدین، ڕەسم کێش
منداڵانی ئێران/ کۆمەڵە ڕەسمەکانی نەسرەدین کسرائیان

بورقەعی، رەزا، کۆکەرەوە
ئەحکامی دیت/ کۆکردنەوە و نووسینی رەزا بورقەعی

فائقی، کازم کۆکردنەوە و وەرگێڕ
چۆن خۆمان سەرقاڵ کەین/ وەرگێڕان و کۆکردنەوە کازم، فائقی

کب، مەنووچهر، وەرگر
خەڵك ناسی ئابووری/ وەرگێڕ مەنووچهر کب

شمارە جەعفەر
غەمنامە رۆستەم وسوهرا. لە شانامەی فیردەوس/
بە هەڵبژاردن و شیکردنەوە جەعفەر شمار.

**٤- کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی یەك کەس (A١٢١,٧)**

ئەو بەرهەمانەی کە کۆکراونەتەوە لە نووسراوەکان یا وتارەکان و قسەکانی یەك کەس، ئەگەر کۆکەرەوەیەکی دیاری هەبێت، بینە ژێر ناوی ئەو کەسە و بۆ کۆکەرەوە شوناسەی زیادکراو لە بەرچاوبگرن.



پاولوف، ئێڤان پتروویچ، ١٨٤٩- ١٩٣٦
هەڵبژاردەی بەرهەمەکانی پاولوف/ کۆکردنەوە خ، کوشتویانتز
١. بابەت الف. کوشتویانتز، خ. کۆکەرەوە
ب. ناوونیشان

ئەو کتێبە کەونانەی کە دەق و ناوەرۆکەکەیان لە لایەن مامۆستا یا پسپۆڕێکەوە گوتراوە و خوێندکارەکان ئەوەیان نووسیوە و کۆیان کردۆتەوە، لە ژێر ناوی کۆکەرەوەی یا ئەو کەسەی کە ئامادەی کردەووە بنووسن (ڕێساکانی C٢١,٥٥ و D٢١,٢٥)

**٥- ئەو بەرهەمانەی کە پیشاندەری کۆمەڵە بەرهەمێکن لە یەك شوێندا (B٢١,٤)**

ئەگەر ئەو بەرهەمەی کە پۆلێن دەکرێت پیشاندەری کۆمەڵێك یا بەشێك لەو بەرهەمانە بن کە لە یەك شوێن (وەك کتێبخانە، پێشانگا، موزە)دا بن، بەرهەمەکە لە ژێر ناوی خاوەن یا ئەو شوێنەی کە بەرهەمەکانی تێدایە بێنن و بۆ کۆکەرەوە یا ئامادەکار ئەو بەرهەمە، شوناسەی زیادکراو بنووسن.

زانکۆی مەشهەد. کۆلێژی ئەدیان و زانستە ئیسلامییەکان.
کتێبخانە پێرستی نوسخە خەتییەکانی کۆلێژی ئەدیان و زانستە ئیسلامییەکان. مەشهەد/ بە کۆششی مەحمود فازڵَ
١. بابەت الف. فازڵَ، مەحمود، کۆکەرەوە
ب. ناوونیشان

ئاستانی قودسی رەزەوی. بنکەی توێژینەوەکانی ئیسلامی. کتێبخانە
پێرستی بابەتی کتێبخانەی بنکەی توێژینەوەکانی ئیسلامی/
ئامادەکردن و نووسینی محەمەد جوان، رەحمەت ئەسود فەتاحی،
محەمەد عەلی خاکساری
١. بابەت الف. جوان، محەمەد، کۆکەرەوە ب. فەتاحی، رەحمەت
ئەسەد، کۆکەرەوە ج. خاکساری، محمد علی، کۆکەرەوە. د. ناوونیشان

هۆزە ئێران باستان
کۆمەڵە کەلوپەلی سوفالی هۆزی ئێرانی باستان/ بە کۆششی عەلی
جەمشیدی
١. بابەت الف. جەمشید، عەلی، کۆکەرەوە
ب. ناوونیشان.

**٦- ئەو حاڵەتانەی کە ناوونیشان وەك سەرشوناسە دەناسرێت (رێسا C٢١,١ و C٢١,٦)**

لە حاڵەتەکانی خوارەوە، بەرهەمەکە لە ژێر سەرشوناسەی ناوونیشان بنووسن:

ا- کاتێ کە بەرهەمی کەسێکی نادیاربێت، یا نەکرێت دیاریبکرێ،

ژورنال سەروژ: مۆدیلی ساڵی ١٩٨٤: جۆرەکانی مۆدیلی منداڵانە/
ئامادەکردن و کۆکردنەوەی بابەت و شێوازەکان لە گۆڤاری بودا.



ب- کاتێ کە بەرهەم بە شێوەی کۆمەڵ یا بەهەرمێك ئامادەکراوە لە ژێرچاودێری گرووپێك بێ ئەوەی ناوی تایبەتیان هەبێت، وەك دەستەی نووسەران.

رێگای ئێمە: و وتارێك سەبارەت بە فێرکردنی لاوان/
لەژێر چاودێری دەستەی نووسەران.

جیهانی هاوچەرخ/ نووسینی زیاتر لە هەشتا کەس لە زانایانی
هاوچەرخی روسیە، وەرگێڕانی عەلی موحسین متین.

ج- کاتێك کە بەرهەمێك زیاتر لە سێ بەرهەمهێنەری هاوبەشی هەبێت.
لەم حاڵەتەدا تەنیا ناوی بەرهەمهێنەری یەکەم کە ناوەکەی لە سەرەتاوە هاتووە بنووسن و لە پاشانیش نیشانەی (...[وەکەسانیتر]) دابنێن.

هونەر و کەلەپووری ئەفریقیای رەش/ نووسینی ئەلکساندەر
ئادانده.... (وەکەسانیتر)، وەرگێڕان: جەلالەدین ئەعلەم
١. بابەت الف. ادانده، ئەلکساندر
ب. اعلم، جەلالەدین، وەرگێر.

د- کاتێك کە بەرهەمێك رێکخراو یا تنالگان نووسیبێ، بەڵام لە یەك یا چەند شوێن لە رێساکانی پێوەندیدار بە رێکخراوەکانەوە نەگونجێت و بەرهەمهێنەرێکی دیاریکراو نەبێت.

ئایین نامەی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار.
تاران: زانکۆی تاران، ١٣٦٥.

ستانداردەکانی بتۆن دروستکردن لە ئەمریکا. — تاران:
کۆمپانیای سیمان ئێران، ١٣٦٥.

### ٧- ئەو بەرهەمانەی کە پەیوەندییان هەیە بە کۆنگرەکان و هتد و (ڕێسای B١٢١,١)

ئەم بەرهەمانە لە ژێر ناوی کۆنگرە یا سمیناری پێوەندیدار بنووسن و ژمارە و ڕێکەوت و شوێنی کۆنگرەکە لە نێو دوو کەوانە ( ) بە سەرشوناسە زیاد بکەن. بۆ کۆکەرەوەی کۆمەڵە وتارەکانیش زیادکراو ڕەچاو بکەن.

کۆنگرەی فیزیۆلۆژی و فارماکۆلۆژی ئێران (حەوتەمین: ١٣٦٤:
مەشهەد) کورتەیەك لە وتارەکانی حەوتەمین کۆنگرەی فیزیۆلۆژی و فارما
کولورای ئێران ٢٥- ٢٢ ڕەزبەر ١٣٦٤/ ئامادەکردن محەمەد/ بك لی
١. بابەت الف. بك لی، محەمەد، کۆکەرەوە.

سیمیناری پاراستنی ژینگە (١٣٦٩: اصفهان)
پیس بوونی ژینگە: کۆمەڵە بابەتی سیمیناری ژینگە، ٢١تا ٢٢
ڕەزبەری ١٣٦٩، اصفهان/ بە کۆششی بەهرام سەمەدی
١. بابەت الف. سەمەد، بەهرام، کۆکەرەوە



### ٨- دەقە پیرۆزەکان (ڕێسای ٢١,٣٧)

بەرهەم یا بەشێك لە بەرهەمە ئایینییەکان کە وەك دەقێکی پیرۆز و ئایینی پەسەندکرابن، وەك کتێبە ئاسمانییەکان، بڕوانامەکان، دوعاکان و لەو بابەتانە لە ژێر سەرشوناسەی ناوونیشانی هاوشێوە ئەوانە (ناوونیشانێکی قەراردادی) بنووسن و بۆ ئەو کەسانەی کە بە هەر شێوەیەك لە بەرهەمهێنانیاندا کاریان کردووە شوناسەی زیادکراو ڕەچاو بکەن.

قورئان
قورئانی پیرۆز و پێرستەکانی قورئان/ بە کۆششی مەحمود رامیار
الف. رامیار، مەحمود، هەڵەچن.

قورئان. فارسی- عەرەبی
قورئانی پیرۆز/ وەرگێڕانی ئیلاهی قومشەیی

### ٩- دەقە کەونەکان بەبێ نووسەر یا نووسەرێکی نەناسیاو (ڕێسا C ٢٥,٤ و ٢٥,١٧ و ٢٥,١٨)

ئەم جۆرە بەرهەمانە لە ژێر سەرشوناسەی ناوونیشانی یەکدەستدا بنووسن و بۆ کەسانێك کە لە بەرهەم هێنانیاندا دەستیان بووە شوناسەی زیادکراوی بۆ ڕەچاو بکەن.

کارنامەی ئەردەشێری بابەکان. فارسی — پەهلەوی کارنامەی
ئەردەشێری بابەکان، لەگەڵ دەقە پەهلەوییەکەی، ئاوانوسی،
وەرگێڕانی فارسی و واژەنامە/ بە کۆشش بەهرام فرەوشی

کەلیلە و دمنە
دەقی تەواوی کەلیلە و دمنە/ پێداچوونەوە محەمەد خزائلی

هەزار و یەك شەو هەڵبژاردە
چەند چیرۆکێکی هەڵبژاردە لە هەزار و یەك شەو/
بە کۆششی ئەحمەد سەعیدی

**١٠- یاسا و ڕێساکان (ڕێسای ٢١,٣١)**

یاساکان و دەقە مافەوانییەکان پەسەندکراوی ڕێکخراوەکانی یاسادانان (وەك پارلەمان) لە ژێر ناوی ناوچەی یاسادانەر (واتا وڵات یا هەرێم) بنووسن و ناوونیشانی سەرەکی قەرارداری ((یاسا و ڕێسا)) پێ زیاد بکەن و بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەرهەم هێنانیاندا دەستیان هەبووە شوناسەی زیادکراوی بۆ ڕەچاو بکەن.

ئێران، یاساو ڕێساکان
کۆمەڵە یاساکانی دامەزراند دەوڵەتی ئێران/
بە کۆششی محەمەد وەتەنی



**١١- گەلاڵەکان و پرۆژە تایبەتییەکان (ڕێسای AB.٢١)**

گەلاڵە و پرۆژە تایبەتییەکانیش وەك ڕێکخراوەکان و تنالگان بنووسن و ناوەکانیان وەك سەرشوناسە بەکاربێنن.

گەلاڵەی گەشەسەندنی ناوچەیی زنجیرەی- ناوەندی لێکۆڵینەوەی
دەروونزانی
دوو گەلاڵەی نموونە ژینگە پارێز پارێزی لەو وڵاتانەی کە بەرەو
گەشەکردن دەچن/ ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی گەشەسەندنی دەروون

**١٢- بەرهەمە پەیوەستەکان (ڕێسای ٢١,٢٨)**

بەرهەمێکی پەیوەستە بە بەرهەمێکیتر (وەك شەرح، تەفسیر، درێژە، تکلمە، کشف اللغە، سیناریۆ و هتد...) لە ژێر سەرشوناسەی خۆیدا بنووسن و بۆ بەرهەمە سەرەکییەکانی شوناسەی زیادکراوی ناو و ناوونیشانە، هەرکام کە شیاو بن، بنووسن.

فرهومەندی، کازم
فەرهەنگی وشەکانی نهج البلاغە/ بە کۆششی کازم فرهومەندی
١. بابەت الف. عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب. نهج البلاغە
ب. ناوونیشان ج ناوونیشان: نهج البلاغە

دسیکان، ویتوریو
سیناریوی فلیم دزی پاسیکسل/ بەرهەمی سەرزار زاویتنی،
سیناریۆ نووس: ویتوریو دسیکان

### ١٣- راپۆرتەکان و توێژەکان (ڕێسای ٢١,٢٥)

ئەگەر راپۆرتێك لە بنەڕەتدا تایبەت بێت بە گوتەکانی کەسێك یا کەسانێك کە لەگەڵیاندا وتووێژ دەکرێت یا بەشدارن لە وتووێژێکدا، ئەوە لە ژێر ناوی بەشداربوون یا وتووێژکەرانی سەرەکی بەرن. بۆ کەسی راپۆرتدەر یا وتووێژکەر شوناسەی زیادکراو بنووسن.

| |
|---|
| فلینی، فدریکو، ١٩٢٠<br>وتووێژ لەگەڵ فلینی سەبارەت بە سینەمای ئیتالیا/<br>ئەدوارد مولینباخ. |

ئەگەر راپۆرتێك تا رادەیەکی زۆر لە زمان راپۆرتدەرەوە بێت، ئەوەی بەرنە لای ناوونیشانی سەرەکی راپۆرتدەر و بۆ کەسانی دیکەش، ئەگەر زیاتر لە سێ کەس نەبن شوناسەی زیادکراو لەبەرچاو بگرن. ئەگەر زیاتر لە سێ کەس بن، شوناسەی زیادکراو بۆ یەکەمین کەس بنووسن.

| |
|---|
| خۆیی، ئیسماعیل، ١٣١٧ راپۆرتدەر<br>ئازادی، حەق و عەدالەت/ وتووێژی<br>ئیسماعیل خۆیی لەگەڵ ئیحسان نەراقی |

### ١٤- وەرگێڕدراوەکان (ڕێسای ٢١,١٤)

وەرگێردراوەکە لە ژێر سەرشوناسەی بەرهەمی سەرەکیدا بنووسن، بۆ وەرگێڕیش شوناسەی زیادکراو لە بەرچاوبگرن.



| |
|---|
| گرون لوند/ نرمن ئەدوارده ١٩٢٠<br>ئامانجەکانی رەفتاری بۆ وانەگوتنەوە و بەها دانان/ نووسینی نرمن<br>گرون لوند، وەرگێڕانی ئەمانوڵڵا سەفەوی |

### ١٥- بەرهەمەکانی اقتباسی (ڕێسای ٢١,٩ و ٢١,١٠)

بەرهەمی (اقتباس) کراو بەو مەرجەی کە کردەوەی (اقتباس) ماهیت و ناوەڕۆکی بەرهەمە سەرەکییەکەی گۆڕی بێت، یا ئەوەی کە ئامرازی دەرخستنی گۆڕابێت، لە ژێر شوناسەی (اقتباس) کەرەوە بنووسن و بۆ بە بەرهەمە سەرەکییەکە شوناسەی زیادکراو لەبەرچاو بگرن، شیکردنەوە، دووبارە نووسینەوە، (اقتباس) تایبەت بە منداڵان سادە نووسینی، بە شێوەکانی چیرۆك یا شانۆنامە لەو ڕێسایانەن.

| |
|---|
| جەعفەریان<br>کەمتیار و کیسەڵ، ئاسانکراوە لە کتێبی کەلیلە و<br>دمنە/سادەنووسی جەعفەریان |

| |
|---|
| قەزوینی، کیوان<br>شەرحی ریازیات خیام/ گ. قزوینی |

# بەشی هەشتەم

## گەڕان بە دوای زانیارییەکانی کتێبناسی لە پۆلێنکردن و ئاشنایی لەگەڵ سەرچاوەکانی پشکنین:

بەشێك لە کاری پۆلێنکردن گەڕان بە دوای زانیارییەکانی کتێبناسی لە سەرچاوەکانی دیکە پێکدێنێت. زۆرجار هەڵدەکەوت کە زانیارییەکانی کتێبناسی ئەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت لە خودی کتێبەکەدا نین و پێویستە کە سەردانی سەرچاوەکانی شیاوتر و باوەڕپێکراو، بدەین ئەو زانیارییانە بپشکنین و کاری پۆلێنکردن تەواو بکەن.

ئەم کارە بە شێوەی ئاسایی گەڕان لە سەرچاوەکان یا (سیرچ — Search) دەگوترێت پێویستی بە ڕێ و ڕەوشێکی تایبەت هەیە، کە بە ممارسە و وردبینی و ئاکادیمیی پێویستیەتی بە تێکڕا ئامانجەکانی گەڕان لە سەرچاوەکاندا بریتین لە:

**١- بەدەستهێنانی زانیارییەکانی کتێبناسی دروست و تەواو نووسینی ئەوانە لە پێشینەکانی کتێبناسی.**

ئەم خاڵە بە تایبەت سەبارەت بە کتێبە فارسییەکان و بەتایبەتیش ئەو کتێبانەی کە وەرگێڕدراونەتەوە دروستە. لەبەر ئەوەی وەرگێڕان، نووسەران و دەزگا بڵاوکراوەکانی ئێرانی زانیاری تەواو و راستەقینە وەك ناوی سەرەکی نووسەران، ناونیشانی سەرەکی پێداچوونەوە، ژمارەی بەرگەکان و ... لە کتێبەکانیاندا.

**٢- پێکهێنانی هاوئاهەنگی و یەکدەستی لە پۆلێنکردندا**

بە گەڕان و بەدەستهێنانی زانیارییەکانی کتێبناسی لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو دەتوانین بەو ئامانجە بگەین، کە پۆلێنکردن لە زۆربەی کتێبخانەکاندا بە یەك شێوە و دووپات بەڕێوەدەچێت، بۆ نموونە یەك کتێب لە هەر کتێبخانەیەکدا پێشینەیەکی یەکدەستی هەیە. مەبەست لەم هاوئاهەنگییە لە نیهایەتدا دروستکردنی یەکگرتوویی کتێبناسی لە کتێبخانەکاندا و ئاسانکاری بۆ خوێنەران لە کاتی دۆزینەوەی ئەو کتێبخانەی کە دەیانهەوێت.

**٣- دەستپێوەگرتن لە کات، خەرجییەکان و هێندێ کار**

ئاشکرایە کە بە کەڵك وەگرتن لە شێوەکانی گەڕان لە سەرچاوەکان و کەلکوەرگرتن لە ئەزموون و بەرهەمی کاری کتێبخانە باوەڕپێکراوەکان، بەکردەوە دەتوانین ژمارەیەکی زۆرتر لە کتێبەکان لە ماوەیەکی کەمدا بە ئاسانی پۆلێن بکەین بۆ نموونە: پۆلێنکەرێك بەبێ ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر تەرخانبکات بۆ پۆلینکردن بەرەی یەکەم، یا بنەڕەتی (Original Cataloging)، بەسەردانی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو (وەك پێرستەکانی میللی ئەمریکا) دەتوانێ ئەو کتێبەی کە پۆلێندەکرێت بیدۆزێتەوە و لە رووی نموونەی کارتی پۆلێنەوە کۆپی بکات ( Copy Cataloging) سەرەڕای ئەوەش، پۆلێنکەرانی تازە پێگەیشتووش کە ناتوانن بەرەی یەکەم پۆلین بکەن، بە ئاسانی بەفێرکردنی کەموکورتی دەتوانین بەم شێوە ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانەی خۆیان پۆلێن بکەن.

*** سەرچاوەکان و ئامێرەکانی پشکنین**

بۆ پشکنین و تەواوکردنی زانیارییەکانی کتێبناسی پێویستە سەردانی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان بکەین. لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا، زانیاری تەواو بەشێوەی کارتی پێرست و لە هەندێك سەرچاوەدا هەندێك لە ئامرازەکانی کتێبناسی دەتوانین بەدەستبێنین. بەهەرحاڵ لێزانی پۆلێنکەر دەبێ لە ناسینی دانە بە دانە سەرچاوەکانی پشکنین و سەردانی شیاوترینیان بێت.



**گرنگترین سەرچاوەکان لە کاری گەران و پشکنین بریتین لە:**

**١- ئەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت.**

گەرچی دەستەواژەی پشکنین لە سەرچاوەکان پێویستە سەردانی سەرچاوەکانی دیکە بێجگە لەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت، بەڵام لە هەندێك شوێندا، دۆزینەوەی و دەرهێنانی هەندێك زانیاری پێویستی بە توێژینەوە و گەڕانی خودی کتێبەوە هەیە لەم حاڵەتەدا سەرەڕای لاپەڕەی ناونیشان پشتی ئەو لاپەڕەیە، پێویستە سەردانی بەشەکانی دیکەی کتێب وەك پێشەکی گوتار، پێشەکی، پشتی بەرگ، کۆتایی کتێب و لەو بابەتانە بکەین، بۆ نموونە، لە زۆربەی شوێنەکاندا دۆزینەوەی رێنووسی لاتینی ناوی نووسەران یا ناونیشانی سەرەکی کتێبە وەرگێڕدراوەکان، تەنیا بە پشکنین و وردبینانەی کتێب (پێشەکی گوتار یا پێشەکی یا ژێرنووسەکان) لواوە. لە هەندێك شوێندا لەوانەیە نموونەی کارتی پێرستی تەواوی کتێب (کارتی پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوە) لە پشتی لاپەڕەی ناونیشاندا هاتبێت کە یاریدەدەری کاریگەری هەیە لە پۆلێنکردنی کتێبدا.

**٢- کتێبناسی میللی ئێران، لیستی کتێبە پۆلێنکراوەکان و پێرستگانەکان (فارسی):**

ئەم جۆرە سەرچاوانە بەو هۆیە کە بریتین لە نموونەی کارتەکانی پێرستی تەواو، گرنگترین و باوەڕپێکراوترین سەرچاوەی پشکنین. بە کەلکوەرگرتن لەم سەرچاوانە کە لە لایەن ناوەندی پۆلێنکردنی و کتێبخانە گەورەکانەوە دروستکراون، دەتوانین بە خێراییەکی زۆرتر کارپشکنین جێبەجێ بکەین و رێژەیەکی زۆرتری کتێب پۆلێن بکەین. هەندێك لەم جۆرە سەرچاوانە بریتین لە:

* لیستی کتێبە پێرست کراوەکان لە ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی کتێب و کتێبخانە کۆکراوەکانی ساڵانە و پێنج ساڵە ١٣٥٤-١٣٥٨ دوایین ژمارە لە ساڵی ١٣٦١ چاپکرا.

* کتێبناسی میللی ئێران (دەورەی نوێ ١٣٦٢) کە لە راستیدا درێژەی کاری سەرچاوەی پێشوو، بەڵام بە شێوەیەکی نوێ و لەسەر بنەمای یاساکانی نوێی پۆلێنکردنی باسیاری ئامادەکراو.

* لیستی کتێبە پێرستکراوەکان لە کتێبخانەی ناوەندی بەڵگەکانی زانکۆی فارسی مەشهەد.

* لیستی کتێبە پێرست کراوەکان لە کتێبخانەی ناوەندی ناوەندی بەڵگەکانی زانکۆکانی تاران — بەهەشتی — تەبریز — چەمران — کرمان و ... هەندێك رێکخراوە و دامەزراوەی دیکە لە هەر کامیان بەشێوەی جیاواز بە ناوونیشانی تایبەتەوە و بە شێوەی جۆراوجۆر چاپ و بڵاوکردنەتەوە. چەند سەرچاوەی دیکە:

١- خانبابا مەشار. پێرستی کتێبە چاپییەکانی فارسی. پێداچوونەوە.
٢- پێرستی کتێبە چاپییە عەرەبییەکان لە سەرەتای چاپەوە تا ١٣٤٤.
٣- ئێرەجی ئەفشار. کتێبە ئێرانییەکان ١٣٣٢-١٣٤٥.

**٣- سەرچاوەکانی غەیرە فارسی:**

أ- پێرستگانی میللی ئەمریکا (National Union Catalog = NUC)

ئەم سەرچاوەیە کە لە لایەن کتێبخانەی کۆنگرەوە بە شێوەی ساڵانە چاپ و بڵاودەکرێتەوە، گرنگترین سەرچاوەی غەیرە فارسییە بۆ گەڕانی نموونە کارتەکانی پێرستی کتێبە جۆراوجۆرەکان.

لە ساڵی ١٩٨٣ بەم لاوە، پێرستگانی میللی ئەمریکا ئیتر بە شێوەی کتێب چاپ و بڵاونەکرایەوە، بەڵکو بە شێوەی میکرۆفیش لە چەند بەشدا (نووسەر، ناوونیشان، بابەت، زنجیرە) و لە ساڵی ١٩٩٧ بەدواوە بە شێوەی CD-Ram بۆ کەڵکوەرگرتنی کتێبخانەکان کە خاوەنی سیستەمی کۆمپیوتەرن دروستدەکرێت. ئەو کتێبانەی کە لەم سەرچاوەیەدا پۆلێنکراون، بریتین لە هەموو زمانەکان. لەم سەرچاوەیەدا، ئەو ناوونیشانە سەرەکییانەی کە دراون بە کتێبەکان بە زمانی ئینگلیزی و بەپێی



ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی کۆنگرەن. هەروەها ژمارەی ریزبەندی کتێبەکان بەپێی دوو ریزبەندی کۆنگرە و دیوییە. لە هەمان حاڵ دەبێ ئاماژە پێ بکەین کە بنکەی CD-MARC هەموو کتێبە چاپ و بڵاوکراوەکان لەخۆ ناگرێت.

ب- پێرستی کتێبەکانی عەرەبی، فارسی و تورکی کتێبخانەی زانکۆی هاروارد (Catalog of Arabic, Persian and Ottoman Turkish Books)

ئەم سەرچاوەیە کە پێنج بەرگ (ج ١-٣، کتێبە عەرەبییەکان، ج ٤ کتێبە فارسی و تورکییەکان ج ٥ پێرستی بابەتی) لە لایەن زانکۆی هاروارد لە ساڵی ١٩٦٨ چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بۆ گەڕانی کتێبەکان بەو زمانانە کە پێش لە ساڵی ١٩٦٨ چاپ و بڵاوکراونەتەوە شیاون.

ج- پێرستی کتێبخانەی دامەزراوەی لێکۆڵینەوەکانی رۆژهەڵاتی زانکۆی شیکاگۆ (Catalog of the Oriental Institute)

ئەم پێرستە لە ١٦ بەرگدا لە لایەن کێتبخانەی دامەزراوەی لێکۆڵینەوەکانی رۆژهەڵاتی زانکۆی شیکاگۆ لە ساڵی ١٩٧٠ چاپ و بڵاوکراوەتەوە بۆ پشکنینی ئەو کێبانەی کە بە زمانەکانی رۆژهەڵاتی نووسراون شیاوە.

د- پێرستگای میللی ئێران (The Iranian National Union Catalog: Acummulative Author List)

ئەم پێرستە لە لایەن ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی کتێب و کتێبخانە لە ٦ بەرگ لە ساڵی ٥٣-١٣٥١ چاپ و بڵاوکرایەوە، بریتییە لەو کتێبانەی کە بە زمانەکانی لاتینی لە کتێبخانەکانی ئێراندان.

**٤- پێرستەکانی کتێبخانە باوەڕپێکراوەکان:**

پێرستەکانی کتێبخانە بڕواپێکراوەکان (وەك کتێبخانەی میللی ئێران، کتێبخانەکان ناوەندی زانکۆکان، کتێبخانەکانی رێکخراوەکان و وەزارەتخانەکان، هەروەها کتێبخانە گەورەکانی وڵاتانی دیکە کە ئێستا لە رێگای ئینتەرنێتەوە

بەردەستدەکەون) دەتوانن بەشێك بن لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی گەورەی پشکنین. کەلکوەرگرتن لەم پێرستانە لە ڕێگای ناوی بەرهەمهێنەران، ناوونیشانەکان و بابەتەکان جێبەجێ دەکرێت و ئەم بەرژەوەندییەی هەیە، کە بە ئاسانی و بە بوونی کەمترین زانیاری کتێبناسی دەکرێت ئەو کتێبانەی کە مەبەستمانە بدۆزینەوە و لە کارتەکانی پێرست کەڵکوەرگرین. سەرەڕای ئەوەش، لەم ڕێگایەوە دەکرێت هاوئاهەنگی و یەکدەستی لە کاری پۆلێنکردن لەگەڵ کتێبخانە گەورەکان و باوەڕپێکراوەکان بپارێزین.

دەست پێراگەیشتن بە پێرستی کتێبخانە بەناوبانگەکانی وڵاتانی دیکە لە ڕێگای ئیمکاناتی ئینتەرنێت (وەك تیل نیت، گوفر، ویب و هتد...) ڕێگایەکیترە کە دەکرێت پشکنینی زانیارییەکانی کتێبناسی جێبەجێ بکرێت.

**٥- کتێبناسییەکانی دیکە، کتێب نامەکان و پێرستەکان:**

ئەم سەرچاوانە ئامرازێکی گرنگن کە یارمەتی پۆلێنکەر دەدا بۆ دۆزینەوەی هەندێك زانیاری باسیاری و لە هەندێك شوێندا، زانیارییەکانی لێکدانەوەیی. کتێبناسییەکان و لەو جۆرە ئامرازانە، لە جۆرەهای گشتی و تایبەتیدا هەیە، بەڵام لێزانی پۆلێنکەر دەبێ لە ناسین و کەڵك وەگرتن لە شیاوترینی ئەوانە بێت تاخێراتر بتوانێ زانیارییەکان کە پێویستییەتی بدۆزێتەوە. لێرەدا لیستی چەند کتێبناسی گرنگ و بە ناوبانگی گشتی هاتووە کە ئاماژەی پێ دەکەین.

١- Books in print (BP) New York, London, R. R. Bowker, ١٩ – V-

ئەمە سەرچاوەی کتێبە چاپییەکانی بازاڕە (بە زمانی ئینگلیزی کە لە سێ بەشی نووسەر، ناوونیشان، بابەت بە شێوەی ساڵانە، هەروەها بە شێوەی CD-RAM و لە ئینتەرنێت چاپ و بڵاودەکرێتەوە و دەکەوێتە بەردەست خوێنەرانەوە.



٢- British National Bibliography (BNB), London, Council of the B.N, B. ١٢٥٠ –V.

کتێبناسی میللی بەریتانیا کە کتێبە چاپ و بڵاوکراوەکان لەم وڵاتەدا دەناسێنێت و بریتییە لە زانیارییە باسیارییەکان.

٣- British Book print. London, Wittaker, New York, Bowker, ١٨٧٤-V.

ئەو سەرچاوەیە پێرستی کتێبە چاپییەکانی ئینگلیزی کە لە بەریتانیادان دەناسێنێت

٤- American Book publishing record (B.P.R). New York, Bowler ١٩٦٠ / A-V.

٥- Cummulative Book index (CBI). New York, H.W. Wilson ١٨٢٨-V.

**٦- سەرچاوەکانی دیکە:**

هەندێك لە زانیارییەکانی کتێبناسی کە بۆ پۆلێنکردن پێویستن دەتوانین لە سەرچاوەکان بێجگە لەوانەی سەرەوە بدۆزینەوە. دەستپێڕاگەیشتن بەم جۆرە سەرچاوانە و ئاشنایی لەگەڵ شێوەی ڕێکخستن و کەلکوەرگرتن لەوانە دەتوانێ کاری پشکنین خێراتر بکات. هەندێك لەم سەرچاوانە بریتین لە:

**أ- ئینسکلۆپیدیاکان:**

لەم جۆرە سەرچاوانە دەتوانین زانیاری سەبارەت بە نووسەران، بە ناوبانگان، هەندێك لە کتێبەکان و بەرهەمە بەناوبانگەکان، شوێنەکانی جوگرافیای، ڕووداوەکانی مێژوویی و بابەتە جۆراوجۆرەکان بە دەست بێنن کە لە کاتی پۆلێنکردنی باسیاری لێکدانەوەیدا بە کەڵکن. بۆ نموونە سەبارەت بە هەندێك لە نووسەران دەتوانین زانیاری وەك ناوی تەواو، ناوی ناوبانگ، ساڵی لە دایك بوو و مەرگ، ناوی لاتینی، هەندێك

له بەرهەمە بەناوبانگەکان، بدۆزینەوە. ڕێژەی ئەو ئینسکلۆپێدیانەی کە دەتوانین وەك سەرچاوە کەڵکیان لێوەرگرین بۆ گەڕان و پشکنین بریتین لە:

*** فارسی**

١- دهخدا، علی اکبر، فەرهەنگ. تاران. ڕێکخراوی فەرهەنگ نامە، ١٣٢٥-، ٤٠ ب (دەورەی نوێ لە ١٤ بەرگدا، ١٣٧٣).

٢- مصاحب، غلامحسین، ئینسکلۆپێدیای فارسی. تاران: فرانکلین، کتێبی گیرفانی ١٣٤٥-١٣٧٤، ٣ ب.

٣- تجلی پور، مهدی، ئینسکلۆپیدیای بابەتی زانستی مرۆڤ، تاران: ئەمریکە بیر، ١٣٤٩، ٣ ب.

٤- زانستنامەی ئێران و ئیسلام. تاران: بنکەی وەرگێڕان و چاپی کتێب، ١٣٥٤-

*** عەرەبی**

١- ئەلقلقشندی، ئەحمەد بن عەلی. صبح الاعشی فی صناعه الانشاء. القاهرة: وزارة الثقافة و الارشاد القومی، ١٣٨٣ ق. ١٤ ب.

٢- النویری، احمد بن عبدالوهاب، نهایة الارب فی فنون الادب. القاهرة: دار الکتب، ١٣٤٢ — ١٣٧٤ ك. م. ج.

٣- وجدي، محمد فرید، دائرة المعارف القرن الربع عشر، العشرین، بیروت: دار المعرفة للطباعة و النشر، ١٩٧١، ١٠ ج.

٤- المنجد فی اللغة و الاداب و العلوم، بیروت، ١٩٧٥.

*** ئینگلیزی**

١- Encyclopedia American. New York. American crop, ١٩٩٥, ٣٠ v.

٢- Encyclopedia Britanica. Chicago Encyclopedia Britanica. ٢٠٠٠, ٢٤ V.



ئەم دوو ئینسکلۆپیدیایە بە شێوەی CD-RAM و پێوەندی بەردەوام لە ئینتەرنێت لە بەردەستدایە.

* فەڕەنسا

١- Grand Larouse, dictionaire encyclopedinge en ٥ volumes paris. Librarrire larousse, ١٩٩٧.

* ئەڵمانی

١- Brokhaus Enzycloppdie in zwanzing branden. Wiesbanden. Brockhaus. ١٩٩٦, ٢٤ v.

**ب) سەرگوزەشت نامەکان (Biographies)**

ئەم سەرچاوانەش وەك ئینسکلۆپیدیاکان بریتین لە زانیاری جۆراوجۆر سەبارەت بە کەسەکان (چ لە نووسەران و بەناوبانگان) سەرگوزەشت نامەکان لە چەشنە جیاوازەکانی گشتی و بابەتی هەیە. لیستی سەرگوزەشتنامەی گشتی بەم شێوەی خوارەوەیە:

*** فارسی:**

١- بامداد، مهدی. مێژووی ئێران لە سەدەکانی ١٢، ١٣، ١٤، تاران: زورا، ١٣٤٧، ٤ ب.

٢- نامە دانشوران ناصری سەبارەت بە شەرح و حاڵی ٦٠٠ کەس لە زانایانی بەناوبانگ، تاران: ١٢٩٦-١٣٢٤، ٧ ب.

٣- سعیدیان، عبدالحسین، بەناوبانگەکانی جیهان: شەرح و حاڵی زانایانی زانستی سروشتی، تاران: علم و زندگی، ١٣٦٣. ١٠٢٣ ل.

٤- کریمی، خسرو. بەناوبانگەکانی جیهان: ٧٦٠ بیوگرافی لە کەسایەتییەکانی بەناوبانگ. —تاران: پەیرە، (بی تا). ٦٦٦ ل.

*** عەرەبی:**

١- الزرکلی، خیرالدین، الاعلام: قاموس تراجم الاشهر الرجال و النساء من العرب المستعربین و المستشرقین. القاهرة، ١٩٥٤-١٩٥٩. ١٠ ب.
٢- مدرس، محمد علي. ريحانة الادب في تراجم المعروظين بالكنية و اللقب يا كنى و القاب. پێداچوونەوەی... تبریز: خەیام، ١٣٦٩ — ١٣٤٩. ٨ ب.
٣- ابن خلکان: احمد بن محمد. وفیات الاعیان و ابناء ابناء الزمان... پێداچوونەوە م.- بیروت: دار صادر، ١٩٦٨-١٩٧٢. ٨ ب.

*** ئینگلیزی**

١- Webster's Biographical Dictionary, Spring field, mass, G and merian. ١٩٨٤.
٢- Dictionary of International Biography. ٢١th ed. London. Int Biographical comter. ١٩٩٠.
٣- Thomas, Joseph. Universal Pronouning dictionary of Biography and mythology ٥th ed. London. J. B. Lippincott, ١٩٧٦. ٢ V.
٤- The McGraw – Hill Encyclopeida of word biography. New York. McGraw- Hill ١٩٧٣. ١٢ V.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە سەرگوزەشت نامەکان بە ناوونیشانی Who is Who وە یا Who was Who چاپ و بڵاودەکرێنەوە.



*** فەرەنسی**

١- Biziere, Jean-maurice. Dictionarier des Biographies. – paris: A.colino ١٩٩٢ – ١٩٩٥. ٦ V.
٢- Grimall, Pierre. Dictionnaire des biographies. Paris: Presses univeriaires de France, ١٩٨٥. ٢ V.
٣- Vaperau, Gustave, Dictionniaire di universal. Des contemporains contenaut tous les personnes. Paris: Hachette, ١٨٨٠.

**ج- پێرستەکانی بەڵگەداری ناوەکان:**

بۆ گەڕان بە دوای ناوی کەسان (چ ئەوانەی راستەقینەبن وەك نووسەران، وەرگێڕان،... و یا کەسانی خاوەن ماف وەك رێکخراوەکان و دامەزراوەکان) سەرەڕای سەرچاوەکانی پێشوو دەتوانین ئاماژە بەو سەرچاوانەی خوارەوە بکەین:

١- دامەزراوەکانی لێکۆڵینەوە پلان دارِشتنی زانستی و فێرکردن. ناوەندی خزمەتگوزاری کتێب و کتێبخانە. پێرستی بەڵگەداری ناوەکانی بەناوبانگی و نووسەران، ١٣٥٦.
٢- حیکمبان، ابو الفتح، پێرستی بەناوبانگەکانی ئێران، لە سەرەتای دەورانی ئەفسانەیی تا زەمانی هاوچەرخ... تاران: زانکۆی میللی ئێران، ١٣٥٧، ٢ ب.
٣- مشار، خانبابا. نووسەرانی کتێبی چاپی فارسی و عەرەبی لە سەرەتایی چاپەوە تا ئێستا. — تاران: ١٣٤٠-١٣٤٤. ٦ ب.

*** ئینگلیزی**

١- United states. Library of congress. Library of congress names heading with reference. Weshington, D.C. ١٩٧٤.

٢- Thomas, Joseph. universal pronouincing dictionary of biography and mythology. ٥th ed London, J.B. Lippiacott. ١٩٧٦. ٢ V.

*** شێوازەکانی زانستیانەی گەڕان و قۆناغەکانی:**

پێداگیری سەرەکی ئەم بەشە لەسەر پیشاندانی ڕێگا و شێوەی پشکنینی زانیارییەکانی کتێبناسی لە گەورەترین بڕواپێکراوترین سەرچاوەکانی گەڕان واتا ((پێرستگانی میللی ئەمریکا)) (NUC)، هەروەها بنکەی CD-MARC. هۆی ئەم کارەش، هەمە لایەنە بوون و بڕواپێکراو بوونی ئەم سەرچاوانەن کە زۆربەی کتێبەکان بە زمانی لاتینی و زۆربەی کتێبەکان بە زمانەکانی دیکەی کە لە کتێبخانەی کۆنگرە یا لە کتێبخانەکانی گەورەی ئەمریکا پۆلێنکراون لە خۆ دەگرێت. سەرەڕای ئەوەش بەشێکی گەورە لە کۆمەڵە کتێبخانەکانی زانکۆیی و تایبەتی لە ئێران کە کتێبەکانیان بە زمانی لاتینی (ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی) پێکدێنن کە بۆ پۆلێنکردنی خێرا، ئاسان و دروستی ئەوانە بە سەرچاوەیەکی بڕواپێکراو وەك (NUC) و CD-MARC پێویستە گەڕان لە (NUC) وە یا لە CD-MARC بە بوونی لانیکەم یەکێك لە زانیارییەکانی کتێبناسی خوارەوە دەکرێت جێبەجێ بکرێت.

**١- ناوی بەرهەمهێنەر:**

لە وێڕاگە لە زۆربەی حاڵەتاکاندا، ناوی بەرهەمهێنەر، دەبێتە سەرشوناسەی بەرهەم، هەر لەم ڕێگاوەش دەتوانین لە (NUC) یا CD-MARC، زانیاری سەبارەت بەو کتێبەی کە دەمانهەوێت بدۆزینەوە و لە رووی ئەوەوە پۆلێن بکەین. سەبارەت بەو کتێبانەی کە وەرگێڕدراونەتەوە سەر زمانی فارسی، بۆ دۆزینەوەی ناوی نووسەر دەبێ بەم شێوە کار بکەین، کە ناوە لاتینییەکەی بە کەلکوەرگرتن لە



زانیارییەکانی خودی کتێب یا بە سەردانی پێرستەکانی بەڵگەداری ناوی بەناوبانگان و نووسەران دەپشکنین و دوایی لە (NUC) یا CD-MARC دەگەڕێین بەدوایدا لە هەندێك لە کتێبەکاندا ناوی نووسەر لە پشت لاپەڕەی ناونیشان، پشتی بەرگ، پێشەکی تۆمار یا تەنانەت لە کتێبنامەی کۆتایی کتێبەکەدا هاتووە. لەم رووەوە بۆ دۆزینەوەی پێویستە بەناو بەستە جیاوازەکانی کتێبدا بگەڕێین. بۆ نموونە: ناوی لاتین ((ئەی بهاسکار)) نووسەری کتێبی ((تەفسیری رادیولوژیکی دەم و ددان)) نە لە لاپەڕەی ناونیشان یا پشتییەوە و نە لە پێش گوتاردا هاتووە، بەڵکو لە پێرستی سەرچاوەکانی کۆتایی بە ڕێنووینی ((Bhaskar)) هاتووە. کە دوای ئەوەی دۆزیمانەوە لە (UNC) یا CD-MARC دەگەڕێین بە دوی کارتی پۆلێنەکەدا ئەگەر نەمانتوانی بە ڕێنووسی لاتینی ناوی نووسەر بدۆزینەوە دەتوانین لە سەرچاوەکانی دیکەوە وەك لەوە ئینسکلۆپیدیاکان یا سەرگوزەشتنامەکان کەڵکوەرگرین. ئەگەر لەم سەرچاوانەشدا نەماندۆزییەوە دەتوانین بە سەرنجدان بە باری نەتەوایەتی و شێوەی دەربڕینی دروستی ناوەکە بە کەلکوەرگرتن لە پیتە ئینگلیزییەکان، بیکەین بە لاتینی و لە (UNC) یا CD-MARC بە شوێنیدا بگەڕێین.

ئەگەر ناوی نووسەرێك بەو شێوەیە نەدۆزرێتەوە دەتوانن بەم شێوازانەی خوارەوە کار بکەن:

* ئەگەر ناونیشانی سەرەکی کتێب بە زمانی ئینگلیزی دەستبکەوێت سەردانی نیشاندەری ناونیشانەکان لە CD-RAMدا دەکەین ئەگەر ئەم سەرچاوەیە لە بەردەستدا نەبوو. دەگەڕێین بە دوای ناونیشانەکان لە Books in Print و ناوی نووسەر دەدۆزینەوە.

* ئەگەر ناونیشانی سەرەکی کتێب لە بەردەستدا نەبوو، بە ئاگایی لە بابەتی کتێبەکە سەردانی دەورەکانی بابەتی کتێبناسییەکان ناوبراو یا دەورەی بابەتی ((NUC)) یا نیشاندەری بابەتی لە CD-MARC دەکەین. بۆ نموونە بۆ دۆزینەوەی کارتی پێرستی کتێب ((کابلەکان تا ٣٠ کیلۆمەتر)) نووسینی ((اولریش وندت)) بەم شێوە کاردەکەین کە

لە دەورەکانی بابەتی ((NUC)) لە ژێر ناوی ((Cables)) بگەڕێن، ئەو کات کارتی پێرستی کتێب لە ژێر سەرشوناسەی Wendt, Ulrish دەدۆزنەوە. سەردانی نیشاندەری بابەتی CD-MARCیش بە کەڵکە.

* لەوانەیە هەڵەی چاپی ناوی نووسەر لە کتێبە وەرگێڕدراوەکاندا هەبێت، کە دەبێ ئەوەتان لەبەرچاوبێت. لەم حاڵەتەدا پێویستە سەردانی بەشەکانی دیکەی کتێب بکەین و بگەڕێین بە دوای ناوی دروستدا، یا بە هەبوونی ناوونیشانی یا بابەتی کتێب سەردانی ((NUC)) یا ((BIP)) دەکەین.

* لە هەندێك شوێندا وەرگێڕان دەستدەکەن بە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی چەند بەرهەم لە یەك نووسەر یا چەندین نووسەر، لە یەك سەرچاوە یا سەرچاوەی جۆراوجۆر و ئەوانە بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ چاپ و بڵاودەکەنەوە. لەم حاڵەتانەدا دەبێ وردبین بین کە لە سەرچاوەکاندا وەك ((NUC)) یا ((CD-MARC)) کتێبێك بەو تایبەتمەندیانە و بە زمانی سەرەکی بوونی نییە.

❖ لە هەموو بەشەکاندا کە لە پێرستگاکان و کتێبناسییەکاندا دەگەڕێین پێویستە ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی سەرەکی لە خودی کتێبەکەدا کە پۆلێندەکرێت یا لە سەرچاوەکانی دیکە دیاریبکەن. ئەو کات سەردانی دەورەکانی پێوەندیدار بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش وردبینانە بەشە جیاجیاکانی کتێب بپشکنن. بۆ نموونە: لە رووی دواین ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو بەرهەمەی کە وەك سەرچاوە لەو کتێبەی کە پۆلێندەکرێت نووسرابێت، دەتوانن ساڵی چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمی سەرەکی بدۆزنەوە. (هەروەها لە رووی "Books in Print") وە.

**٢- ناوونیشانی سەرەکی:**

لە رێگای ناوونیشانی سەرەکیشەوە دەتوانن ئەو کتێبەی کە پۆلێن دەکرێت بدۆزنەوە.

هەروەها، پشکنینی ناوونیشانی سەرەکی و نووسینی ئەوە لە شوێنی یادداشتەکانی پێرستەوە هەم بۆ خوێنەران و هەمیش بۆ کارگێڕانی کتێبخانە گرنگە. بۆ پشکنین لە رێگای ناوونیشان بەگەڕانی خودی ناوونیشانی سەرەکی بەم شێوازانەی خوارەوە کار بکەن:



* لە هەندێك شوێندا لەوانەیە ناوونیشانی سەرەکی بەرهەمێك لە پشت لاپەڕەی ناوونیشان، پێشەکی وتار یا لە پشت بەرگی کتێبی وەرگێڕدراوەوە هاتبێت کە ئەگەر وابێت، کاری پشکنین لە سەرچاوەکاندا ئاسانتر دەبێت.

* لە هەندێك جاریش لەوانەیە ناوونیشانی سەرەکی لە کتێبی وەرگێڕدراودا بە تەواوی نەهاتبێت واتا لەوانەیە بەشێك لە ناوونیشانی سەرەکی بەمەیلی وەرگێڕ یا دەزگای چاپ بسڕێتەوە. بۆ نموونە زۆرجار دەبیندرێت کە وشەکان یا رستەکانی سەرەتایی وەك "Fundamentals of Introduction to" و "Basic of" و " Reviews on" لە کتێبی وەرگێڕدراودا لە سەرەتای ناوونیشانی بسڕێتەوە. لەم حاڵەتانەدا، پۆلێنکەر دەبێ بە وردی زانیارییەکانی ئەو کتێبەی کە وەرگێڕدراوەتەوە لەگەڵ زانیارییەکانی کتێبە سەرەکییەکە لە سەرچاوەکاندا هەڵسەنگێنێت تا ناوونیشانی سەرەکی و تەواو بدۆزێتەوە.

* لە هەندێك شوێندا لەوانەیە کتێبێك بە زمانی سەرەکی وەرگێڕدرابێت و لە بەشە جۆراوجۆرەکاندا و بە ناوونیشانی جیاواز وەك کتێبێکی سەربەخۆ چاپ و بڵاوبکرێتەوە.

لە حاڵێکدا لەوانەیە تەنانەت لە خودی کتێبی وەرگێڕدراودا هیچ ئاماژەیەك بەمە نەکرابێت، بۆ نموونە هەریەك لە بەرگەکانی جیاوازی کتێب " The cambridge history of Iran" (وەرگێڕانی حسن انوشە) بە شێوەی جیا وەرگێڕدراوە و لەگەڵ ناوونیشانە فارسییەکاندا بە شێوەی جیاواز چاپکراوە. لە حاڵێکدا، تا دواین بەرگی وەرگێڕدراوی ئەو بەرهەمە هیچ ئاماژەیەك بە بەرهەمە سەرەکییەکە نەکراوە.

* زۆرجار دەبیندرێت کە ناوونیشانی وەرگێڕدراو لەگەڵ ناوونیشانە سەرەکییەکەی بەرهەمێك کە پۆلێندەکرێت، ئەوەندە جیاوازە کە لە کاتی گەڕاندا لەوانەیە نەدۆزرێتەوە. وەرگێڕەکان زۆرجار وشە بە وشە بەرهەمێك وەرناگێڕنەوە، بەڵکو بە مەیلی خۆیان و بەگرنگیدان بە تایبەتمەندییەکانی زمانی و سەرنجڕاکێشانی خوێنەران ناوونیشان بۆ بەرهەمەکەیان هەڵدەبژێرن.

# بەشی نۆهەم

## پۆلێنکردن پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوە
## (Cataloging in Publiction = CIP)

هەروەك ئاماژەی پێکرا، پۆلێنکردن کارێکی پڕ خەرج، کاتگیر و تا رادەیەك دژوارە. کەم بوونی پۆلێنکەری پسپۆڕ و لێزان، کەم بوونی سەرچاوەکان و ئامێر و کەرستەی تایبەت بە پۆلێنکردن لە گرفتە سەرەکییەکانن، بەتایبەت لە کتێبخانەکانی چکۆڵە و دوورەدەست. زۆربەی کتێبخانەکان کە ناتوانن لە خزمەتگوزارییەکانی ناوەند کەڵکوەرگرن، ناچارن سەربەخۆ دەست بە پۆلێنکردنی کۆمەڵە کتێبەکانی خۆیان بکەن. لەم نێوانەدا، لەوانەیە هەر کتێبخانەیەك بەشێوەیەکی جیاواز لەگەڵ کتێبخانەکانی دیکە کاری پۆلێنکردن بکات و لە دواییدا هەڵەگەلێك بەرچاو لە پێرستدا پێکدێت. بە واتاییێکی دیکە، لەوانەیە یەك کتێب لە چەندین کتێبخانەدا بە شێوازی جۆراوجۆر پۆلێن بکرێت و لە کۆمەڵەکەدا یەکدەستی و هاوئاهەنگی لە نێوان کتێبخانەکاندا نەمێنێت.

هەروەها کتێبخانەکان تووشی خەرجێکی قورس بن لە سەرمایەکانیان بۆ پەرەگرتن و گەشەسەندنی خزمەتگوزارییەکانی خۆیان دووربکەونەوە.

بەمەبەستی دووری گرتن لەم جۆرە گرفت و کێشانە، بیری دروستکردنی کارتی پێرستی هەر کاتێك هاوکات لەگەڵ چاپ و بڵاوکردنەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست لە لایەن هەندێك لە کارگێڕانی کتێبخانەکانی ئەمریکا و ئینگلیزەوە دروستکردن و فرۆشتنی کارتەکانی چاپی کتێبخانەی کۆنگرە و هەندێك لە دامەزراوەکانی دیکەش پەرەیسەند، بەڵام لە ساڵی **١٩٥٨** شوورای سەرچاوەکانی کتێبخانەی (Council on library Resource) بە شێوەیەکی



شیلگیرانە پێشنیارەکەیان پێ و شوێن گرت و ئەرکی جێبەجێ ئەوەیان خستە ئەستۆی کتێبخانەی کۆنگرەوە.

کتێبخانەی کۆنگرەش بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئەو کارە، پرۆگرامی بە ناوونیشانی ((پۆلێنکران لە سەرچاوەکاندا)) (Cataloging in Sources CIS) لە نێوان ساڵەکانی **١٩٥٨** تا **١٥٥٩** جێبەجێکرد و لەو ماوەیەدا **١٢٠٣** ناوونیشانی کتێبی لە **١٥٧** دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەمریکای پۆلێنی پێش لە بڵاوکردنەوە کرد.

دوای هەڵسەنگاندنی ئەو پرۆژەیە و دیاریکردنی کەند و کۆسپەکان و کورتییەکانی هەروەها وتووێژ لەگەڵ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی جۆراوجۆر، جارێکیتر پرۆژەی پۆلێنکردنی پێش لە چاپ بڵاوکردنەوە بە شێوەی تاقیکردنەوە لە ساڵی **١٩٧١** دەستپێکرد گرنگی ئەو گەڵاڵەیە لەوەدابوو کە لەو کاتەدا لە ئەمریکا ساڵانە زیاتر لە **٣٠** هەزار ناوونیشانی کتێب چاپ و بڵاودەکرایەوە.

ئەو کارە پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشانێکی گەورە و بودجەیەکی قورس و گران هەبوو.

بەهەرحاڵ ئەم پرۆژەیە دەستپێکرد و ئێستاش لە ئاستێکی بەربڵاودا بەڕێوەدەچێت. بە گشتی دەتوانین بڵێین کە زیاتر لە **٢٠٠٠** دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەمریکا لەگەڵیدا هاوکاری دەکەن و نزیك بە **٨٥** تا **٩٠** لە سەدەی بەرهەمە چاپ و بڵاوکراوەکان لە ئەمریکا کارتی پۆلێنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوەیان هەیە.

بە تێکڕا ((پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوە)) واتا ئامادەکردن و دروستکردنی زانیارییەکانی کتێبناسی بەرهەمەکان (پێرستی باسیاری و لێکدانەوەی لەگەڵ ژمارەی ریزبەندی دیوی و کۆنگرە) و چاپکردنی ئەوە لە پشت لاپەڕەی ناوونیشانی کتێب لە قۆناغی پێش لە بەرگگرتن و چاپ و بڵاوکردنەوەی تەواوی کتێب. بۆ ئەم مەبەستەش، فورمگەلێکی تایبەت دەخرێتەبەر دەست دەزگاکانی چاپ

و بڵاوکردنەوە تا زانیارییە دروستەکانی ئەو بەرهەمانەی کە لەبەر دەستیاندایە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە بنووسن. کتێبخانەی کۆنگرەش بە پێی ئەم زانیارییانەی کارتی پێرستی پەیوەست ئامادە دەکات و دەیداتەوە بە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە تا لە پشت لاپەڕەی ناوونیشاندا چاپیبکات.

ئەو زانیارییانەی کە لە کارتی پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوەدا دەنووسرێن بریتین لە:

* سەرشوناسە
* ناوونیشان (بەبێ ناوونیشانەکانی غەیرە سەرەکی و بەرامبەرەکانیان و هتد)
* ناوونیشانی زنجیرە (زنجیرەی چاپ و بڵاوکراوەکان)
* یادداشتەکانی گرنگەکان (کتێب نامە و هتد)
* ناوونیشانە سەرەکییەکانی بابەتی
* شوناسە زیادکراوەکان
* ژمارەی ریزبەندی کۆنگرە لەگەڵ نیشانەی نووسەر
* ژمارەی ریزبەندی دیویی
* ژمارەی سپاردەی کارتی کۆنگرە
* ژمارەی ئای. ئێس. بی. ئین (ISBN)

بەم شێوەیە هەندێك زانیاری کتێبناسی وەك بارودۆخی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (شوێنی چاپ و بڵاوکردنەوە، دەزگا، ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوە)، ژمارەی بەرگەکان یا لاپەڕەکان، تایبەتمەندییەکانی فیزیکی و لەو بابەتانە بەهۆی جۆراوجۆریان لە چاپی کتێبەکان لە لایەن دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەوە نانووسرێن.

**نموونە:**

Library of congress cataloging in publication data



The academic library in transition: planning for the ١٩٩٠ dited, and with commentary by Beverly P. Lynch.

P. CM.

Includes bibliographical references.

ISBN ١-٥٥٥٧٠-٠٤٣-٨

١- University of Illinois at Chicago circle. Library

٢- Library, University and College - Illinois – Chicago – Adminstration

٣- Library planning - Illinois at Chicago.

I. Lynch, Berely p.

.٧٧٣٣U ٨٥٧ A٢٧ ١٩٨٩

— ٠٢٧,٧٧٧٣١١dc ٢٠

CIP

نموونەی کارتی پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی کۆنگرە.

*** پۆلێنکردن پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوە لە وڵاتانی دیکە.**

سەرەڕای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لە هەندێك وڵاتانی دیکەش پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوە دەستیپێکرد. لە سۆڤیەتی پێشوو، چەندین دامەزراوەی گەورە چاپ و بڵاوکردنەوە لە ساڵی **١٩٦١** نموونە کارتەکانی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوەی لە پشت لاپەڕەی ناوونیشانی کتێبە پڕ لیتراوەکان، بە تایبەت ئەو کتێبانەی کە کتێبخانە گشتییەکان دەیانویست لە بەرازیل پڕۆژەی پۆلێنکردنی پێش لە چاپ و بڵاوکردنەوەی لە ساڵی **١٩٧١** دەستیپێکرد و دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە پێشوازیان لێکرد.

لە هەندێکی تریش لە وڵاتان ئەم پڕۆژەیە بە شێوەی تەواو یا پەرش و بڵاو بەڕێوەچوو.

پاش پۆلێنکردن و ئامادەکردنی چەشنەکانی کارتی پێرستەکان پێویستە (بەرهەمهێنەران، چ لە کەسانی راستەقینە بن یا خاوەن ماف وەك نووسەر، وەرگێڕ، پێداچوونەوە، کۆکەرەوە، هەڵەچن، وێنەکێش و...، ناوونیشانەکان و ناوونیشانە غەیرە سەرەکییەکان، زنجیرەکان، بابەتەکان و ئیرجاعەکان بابەتی و ئیرجاعەکانی بەرهەمهێنەران)، دەبێ ئەوانە بەشێوەی دروست و شیاو لە ئیندێکسەکاندا رێکوپێك بکرێن تا بۆ کەلکوەرگرتن بکەوێتە بەردەست خوێنەران و کارگێڕانی کتێبخانەوە. لە رێکخستنی کارتەکانی پێرستدا، دەبێ ئامانجەکانی خوارەوە لە بەرچاو بگرین.

* الف) بە چ شێوەیەك دەتوانین کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە بە شێوەیەکی باشتر و تەواوتر بە خوێنەران بناسێنین؟ بە واتاییەکی دیکە، بە سەرنجدان بەجۆری کتێبەکانی کتێبخانە و جۆری ئەو خوێنەرانەی کە سەردانی کتێبخانە دەکەن کام شێواز گونجاو ترە؟ خوێنەران زۆرتر لە چ رێگایەکەوە دەگەڕێن بە شوێن زانیارییەکاندا، نووسەر؟ ناوونیشان؟ یا بابەت؟

* ب) دەستپێڕاگەیشتنی خێرا و ئاسان، کە ئامانجێکیتر لە هەژمار دێت، بە چ شێوە بەرهەم یا یەك بابەت دەتوانن ئەو کتێبەی کە مەبەستیانە بە کورتترین کاتدا بدۆزنەوە. سەرنجدان بەو دوو ئامانجەی سەرەوە لە شێوەی رێکخستنی کارتی پێرستەکان و لە ئیندێکس جۆری کتێبخانە (زانکۆیی، گشتی، منداڵان،...) و شێوەی کەلکوەرگرتن لە ئیندێکسەکان بۆ نموونە، بەهەمان شێوە کە لە کتێبخانەیەکی منداڵاندا ئامادەکردنی پێرستێك بۆ کتێبخانە شیاوە؟

بۆ نموونە، بەهەمان شێوە کە لە کتێبخانەیەکی منداڵاندا ئامادەکردنی پێرست بەو رادەیە پێویستی خوێنەرانی منداڵ نییە یا ئەوەی کە لە کتێبخانەیەکی قوتابخانەدا پێرست دەبێ بەسادەترین شێوە ئامادە بکرێت، پێرست کتێبخانەیەکی زانکۆیی یا تایبەتی دەبێ بە تەواوترین ئامادە بکرێت.

بە تێکڕا جۆرە ناسراوەکانی رێکخستنی پێرستەکان لە ئیندێکسەکاندا بەم شێوازانەی خوارەوەیە:

## ١- پێرستی فەرهەنگی یا واژەنامەیی (Dictionary Catalog)

لەم جۆرە پێرستەدا، هەموو کارتەکان، بەچاوپۆشی کردن لە چەشنەکانیان (بەرهەمهێنەران ناوونیشانەکان، زنجیرەکان، بابەتەکان، ئیرجاعەکان) لەگەڵ یەکتر بە شێوەی فایل هەیە و ئەویش تێکەڵ یا فەرهەنگییە. ئەم چەشنە پێرستە پتر شیاوی کتێبخانەکانی قوتابخانە و کتێبخانەکانی گشتی چکۆڵەیە. گەورەترین بەرژەوەندی پێرستی فەرهەنگی ئەوەیە کە گەڕان بۆ ئەو بابەتانەی کە مەبەستن لە یەك قۆناغدا جێبەجێ بکرێن و خوێنەر ئەوەی کە پێویستییەتی، لە شوێنی ئەلف و بێ خۆیدا بیدۆزێتەوە. لە بەرامبەر کێشەی رێك و پێککردنی کارتەکان و ئەلف و بێ کردنی وردبینانەی چەشنەکانی شوناسەکان لە بەربەستەکانی سەرەکی ئەم شێوازەیە.

## ٢- پێرستی جیاجیا یا تفکیکی (Divided Catalog)

لەم پێرستەدا، بە پێچەوانەی پێرستی فەرهەنگی، شوناسەکان لە یەکتر جیابوونەتەوە و بەپێی پێداویستی خوێنەران لە ئیندێکسەکانی جیاوازدا رێکدەکرێن. بەم پێیە، پتر لە یەك فایل دروستدەکرێت، وەك پێرستی بەرهەمهێنەر، پێرستی ناوونیشان و پێرستی بابەت. گەورەترین بەرژەوەندیی ئەم شێوازە لە ئاسانکاری کەڵك وەگرتن لەوە دایە. بەم واتایە کە بەسەرنجدان بە پێداویستییەکان دەتوانین بە پێرستی پەیوەست (نووسەر) سەربدەین و ئەو کتێبەی کە دەمانهەوێت بیدۆزینەوە.

رێککردنی کارتەکانی شوناسەش لەم پێرستەدا ئاسانترە. لە بەرامبەردا، ئەگەر جۆری پێرست بە روونی لەسەر هەریەك لە ئیندێکسەکان (فایلەکان) دیاری نەکرابێت. لەوانەیە خوێنەر بە هەڵە سەردانی ئیندێکسێکی دیکە بکات و بۆ نموونە بۆ دۆزینەوەی نووسەرێکی تایبەت. لە ئیندێکس ناوونیشان سەرقاڵی گەڕان ببێت یا بە پێچەوانەوە. پێرستی جیاواز بە دوو شێوە دەتوانین رێکوپێك بکەین.

أ- پێرستی بەرهەمهێنەر، پێرستی ناوونیشان، پێرستی بابەت.



لەم شێوازەدا هەموو کارتەکانی پێرستی بەرهەمهێنەران واتا نووسەر، نووسەری هاوکار، وەرگێڕ، پێداچوونەوە، کۆکەرەوە. هەڵەچن. وێنەکێش رێکخراوەکان و دامەزراوەکان، کۆنفرانسەکان و ئیرجاعەکانی پەیوەست لە یەك ریزی ئەلف و بێ رێکدەخرێن، کارتەکانی پێرستی ناوونیشان لە یەك ئیندێکسدا و کارتەکانی بابەتی و ئیرجاعەکانی پەیوەست لە ئیندێکسێکی جیاوازدا رێکوپێك دەکرێن. ئەم شێوازە لە کتێبخانەکانی گشتی و هەندێك لە کتێبخانەکانی زانکۆیی کەڵکیان لێ وەردەگیرێت.

ب) پێرستی بەرهەمهێنەر/ ناوونیشان، پێرستی بابەت

لەم رەوشەدا هەموو کارتەکانی پێرستی بەرهەمهێنەران و ناوونیشانەکان لە یەك ریزدا بە شێوەی ئەلف و بێ و هەموو کارتەکانی پێرستی بابەتی لە ریزێکیتردا رێکدەخرێن. ئەم رەوشە زۆرتر لە کتێبخانەکانی زانکۆیی و تایبەتی کاربیان پێ دەکرێت.

## ٣- پێرستی ریزبەندی یا دەستەیی
## (Classed or Classified Catalog)

پێرستێکە شوناسەکان یا کارتەکانی بابەتی بەپێی بابەتەکان و بەرامبەر بە یەکێك لە گەڵاڵەکانی ریزبەندی رێکدەخرێن. ئەو شتەی کە لەم پێرستەدا گرنگە، رەچاوگرتنی یەك لە دوای یەکی بابەتەکانە کە هەر بابەتێك کەم کەم لە دەستەکانی گشتییەوە بەدابەشکردنی تایبەتیتر بە ئاکام دەگات تا خوێنەر سەرەڕای دۆزینەوەی ئەو بابەتەی کە دەیهەوێت هەم بابەتەکانی هاوشێوە و نێزیك لە یەکتر ببینێت و هەم بابەتەکانی گشتیتر پێش لەوان، هەروەها بابەتەکانی تایبەتیتری دوای ئەوەش بدۆزێتەوە. ئەم نەزمە مەنتقیە، وا لە خوێنەر دەکات کە بتوانێ پێوەندی مەنتقی هەر بابەت و پێگەیەکی ئەوانە لە دەستەبەندی زانستەکاندا دەرکی بکات. باشترین نموونەی ئەم جۆرە پێرستە دەتوانین لە گەڵاڵەکانی دەستەبەندی دیوی ببنین.

لە راستیدا کارتەکانی فایلی کۆمەڵە کتێبەکانی کتێبخانە لە سیستەمی دیویی پێرستێکی سیستماتیك کە بەپێی ریزبەندییەکانی گشتی و نەزمی یەك لە دوای یەك

ڕێکخراون، بەڵام جیاوازی کارت فایل لەگەڵ پێرستی ڕەدەیی یا دەستەیی لەوەدایە کە لە کارتەکانی فایلی هەر بەرهەمێك تەنیا یەك کارت هەیە لە حاڵێکدا پێرستی دەستەیی بۆ شوناسەکانی بابەتی دیکە، واتا بابەتەکانی غەیرە سەرەکیش کارتەکانی پەیوەست ئامادە و لە دەستەی مەبەستدا دادەنێت بۆ دۆزینەوەی خێرایی ئەو بابەتانەی کە مەبەستن، بوونی پێرستێکی ئەلف و بێ بابەتی لە تەنیشت پێرستی پێداویستە. بەم پێیە پێرستی دەستەیی هەمیشە لە دوو بەشدا ئامادە دەکرێت.

١- پێرستی سیستماتیك بەپێی نەزمی مەنتیقی لە سەرەوە بۆ خوارەوە وەك پیشاندەری دیویی. بە واتاییێکی دیکە، شوناسەکان لەم پێرستەدا بەپێی ژمارەی دەستەبەندی و بەهەمان شێوە کە کتێبەکان لە جێی خۆیاندا جێدەگرن، ڕێکدەبن.

٢- پێرستی ئەلف و بێ بابەتی، وەك پێرستی نسبی لە سیستەمی ڕیزبەندی دیویی. ئەلبەت ئەم جۆرە پێرستە پتر لەو کتێبخانانەی کە بە تەواوەتی تایبەتین بەکاردێت و ئامادەکردنی ئەوەش کارێکی سادە و ئاسان نییە، هەر بەم هۆیەوە زۆر بەکەمی لەوە کەڵك وەردەگرن و زۆربەی کتێبخانەکان لە دوو شێوازی پێشوو کەڵك وەردەگرن.

پێرستی دەستەیی لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ لە ئەمریکا پشتگوێ خرا، بەڵام لە بەریتانیا هێشتا هەندێك کتێبخانە لەو جۆرە پێرستە کەڵك وەردەگرن.

### ٤- پێرستی دەستەیی – ئەلف و بێ
### (Alphabetico – Classed Catalog)

چەشنێکی دیکەی پێرستی دەستەیی، پێرستی ڕیزبەندی ئەلف و بێیە کە پێکهاتووە لە نەزمی دەستەیی و نەزمی ئەلف و بێ. لەم شێوازەدا، شوناسەکانی بابەتی بە شێوەی ئەلف و بێ ڕیزدەکرێن و هەر بابەت بە شێوەی زنجیرەی یەك لە دوای یەك دابەشدەکرێن بە بابەتەکانی غەیرە سەرەکی. نەزمی ناوخۆی هەر بابەتێك



نسبەت بە بابەتێکی غەیرە سەرەکی دیکەش بە شێوەی ئەلف و بێیە. لە واژەنامەی کتێب و کتێبخانەدا واتای پێرستی ڕیزبەندی بە شێوەی خوارەوە هاتووە.

پێرستێکە کە لەگەڵ شوناسەکانی بابەتی گشتی کە بە شێوەی ئەلف و بێ ڕێکخراون و پاشان بەبابەت هاییێکی غەیرە سەرەکی، دواتریش بە شێوەی ئەلف و بێ دابەشکرابێت.

**نموونە:**

فێرکردن   فێرکردن: ئامار فێرکردن: سەرەتایی

((مەبەست لە پێرستی ڕیزبەندی ئەلف و بێ پێرستێکە کە سەرەڕای ئەلف و بێ بوون لە گشتییەوە بۆ خوارەوە ڕیزبەندی کراوە. لە ئاکامدا بابەتەکان بەپێی پێوەندییان لەگەڵ سەرەکییەکاندا، لە تەنیشت یەکتر دادەنرێن .

**نموونە:**

زانستی سروشتی

زانستی سروشتی: گیاناسی

زانستی سروشتی: گیاناسی – گیاناسی زەمینی

زانستی سروشتی: گیاناسی – گیاکانی زەمینی – دوو چڵی

زانستی سروشتی: گیاناسی – گیاکانی زەمینی – دوو چڵی – باقلە

زانستی سروشتی: گیاناسی – گیاکانی زەمینی – دوو چڵی – فاسۆلیا

زانستی سروشتی: گیاناسی – گیاکانی زەمینی – دوو چڵی – نۆك

ئەم جۆرە پێرستە زۆر بە کەمی لە کتێبخانەکانی ئەمڕۆدا بەکاردێت.

بەسەرنجدان بە ڕێژەی ڕوو لە زۆربوونی زانیارییەکان و ڕێژەی سەرچاوەکان کە بە کۆمەڵەی کتێبخانەی زیاد دەکرێت، کەلکوەرگرتن لە سیستەمەکانی دەستی بەهۆی خێرایی کەم، سنوورداربوونی پانتایی کار، بە کارهێنانی وزە و خەرجی لە ڕادەبەدەر، ئیتر کاریگەر و لە بەرژەوەندیدا نییە. ئەمڕۆ کۆمپیوتەر بەهۆی تایبەتمەندییەکان و تواناییەکانی تایبەت بە خۆی (وردبینی، هەمەلایەنە، چڕوپڕ خێرایی لە ڕادەبەدەر) وەك شیاوترین ئامێر بۆ جێبەجێکردنی کاروبارەکانی جۆراوجۆرەکانی کتێبخانە سەرنجڕاکێش و کەڵکی وەردەگیرێت. لە کاری پۆلێنکردنیشدا کۆمپیوتەر توانیویەتی بە یەك جار پاشەکەوت کردنی زانیارییەکانی هەر کتێب یا بەڵگەیەك، ئەو زانیاریانە بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر و شیاوی پێداویستی خوێنەر توانای پشکنین و دۆزینەوە پیشاندانی هەیە. خێرایی و توانایی لە ڕادەبەدەری کۆمپیوتەر، دەتوانی وا لە خوێنەر بکات تا هەر کتێب یا کۆمەڵێك لە کتێبەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا بدۆزێتەوە و لەسەر شاشە پیشانیان بدات. سەرەڕای ئەوەش، بە کەلکوەرگرتن لە کۆمپیوتەر لە کاری پۆلێنکردن دەتوانین ڕاپۆرتەکان و ئامارە جۆراوجۆرەکان لە کاری بەشی پۆلێنکردن (ژمارەی ئەو ناوونیشانانە کە هەیە، ژمارەی ناوونیشانەکانی پێرستکراو، ڕێژەی نوسخەکانی هەر ناوونیشان، ڕێژەی ناوونیشانەکان لە هەر بابەتێکدا، ڕەوتی ڕوو لە زیاد بوو کتێبەکان لە هەر دەرفەتێکی زەمانیدا، و...) ئامادە بکەین.

**⋆ گەڵاڵەی مارك:**

لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٥٠ کتێبخانەی کۆنگرە لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە ئیمکانی کەلکوەرگرتن لە شێوەکانی ئوتوماتیکی بۆ کاروباری ناوخۆی دەستپێکرد. لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠. بە پشتیوانی ماڵی شورای سەرچاوەی کتێبخانەکان توێژینەوەی جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە بەڕێوەچوو و لێکۆڵینەوەیەکی دیکە سەبارەت بە گۆڕینی داتاکانی یا زانیارییەکانی کارتی پێرستەکانی کتێبخانەی کۆنگرە بەشێوەی ماشێن خوێن و چاپی ئەوانە بە کۆمپیوتەر دەستپێکرد. ئەو لێکۆڵینەوانە

کە بە ئارەزووومەندی و زەوقێکی تایبەتەوە بەرەو روو ببوو لە ساڵی ١٩٦٦ بە شێوە گەلاڵەیەك هاتە ئاراوە و ناوی (مارك)ی لێنرا. لەم گەلاڵەیەدا شازدە کتێبخانەی جۆراوجۆر لە چەندین شوێنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاوکارییان هەبوو. لە ئاکامدا لە ئۆکتوبری ١٩٦٦ دابەشکردنی شریتە مەغناتیسییەکانی مارك دەستپێکرد.

لە ماوەی نۆڤەمبەری ١٩٦٦ تا ژانویەی ١٩٦٨ نزیکەی ٥٠٠٠٠ پێشینەی پۆلێنکراوی کتێبە ئینگلیزییەکان گۆڕدران بە کۆمپیوتەری و بە شێوەی شریت لە نێوان کتێبخانەکاندا دابەشکران.

سەرکەوتنی ئەو پرۆژەیە بوو بە هۆی ئەوەی کە تا کتێبخانەی کۆنگرە بۆ گەلاڵەیەکی بنەڕەتی و چرووپڕ خۆی ئامادە بکات. لە مانگی مارسی ١٩٦٩ بەشی خزمەتگوزاری دابەشکردنی مارك پێکهات و دابەشکردنی بەرفراوانی شریتی مارك دەستپێکرد. لە درێژەی ساڵەکانی دواییدا، سەرەڕای کتێبە ئینگلیزییەکان، کتێبەکان بە زمانی دیکە و کەرستەکانی دیکەش بەگەلاڵەی مارك زیادکران و مارکس سەرەتایی تەواو بوو کرا بە مارکی ٢.

ئێستاش پێشینەکانی کۆمپیوتەری مارك کە سەنتەری زانیارییەکانی مارکی پێی دەڵێن، لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بنکەی کتێبناسی ((ئۆ. سی. ال. سی)) (ناوەندی کتێبخانەی پەیوەستە)، "W. L. N" (تۆڕی کتێبخانەکانی رۆژئاوا)، مارك کتێبخانەی کۆنگرە و چەند سەنتەری دیکە لە بەردەست کتێبخانەدایە.

یەکێك لە لایەنەکانی پۆزەتیڤی پرۆژەی مارك ئەوەیە کە هەمیشە پۆختەتر بوو و خۆسازدان لەگەڵ پێداویستەکانی تایبەت بە کتێبخانەکان گرنگی پێدراوە و پێداچوونەوەی لەسەرکراوە. مارکی ئەمریکی و مارکی بەریتانی نوسخەگەلێك جیاواز بەحسێب دێن کە بە پێی کتێبخانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا دارێژراون هەروەك ئەو مارکەی کە رابردوو لە بەرچاودەگرێت پرۆژێیکی دیکەیە کە سەبارەت بە گۆڕینەوەی کارتی پێرستەکانی کەون بە زانیارییەکانی



کۆمپیوتەری لەبەرچاوگرتووە. ئێستا دەیان مارکی میللی لە ولاتە جۆراوجۆرەکاندا پێکهاتووە. یونی مارك (UNIMARC)، بە هەمان شێوە کە لە بەشی دواییدا شیدەکرێتەوە، قالبێکی (فورمەت)ی نێو دەوڵەتی کە پەیوەستە بە رێساکانی پۆلێنکردنی ولاتێکی تایبەتەوە نییە، بەم هۆیەوە لە گۆڕینەوەی کتێبناسی لە ئاستی جیهان و لە ژێر چاودێری کتێبناسی جیهانی (UBC) یارمەتی دەدات.

بەرهەمی کارو پرۆژەی بەشێوەگەلێکی جۆراوجۆر (شریتی مەغناتیسی، پێوەندی بەردەوام لەگەڵ سەنتەرەکانی مارك، و CD-RAM) لەبەردەست کتێبخانەکاندایە. ئێستا رێژەیەکی زۆر لە کتێبخانەکان لە سەرانسەری ولات بەشێوەی بەردەوام بە تۆڕەکانی زانیارییەکانی کتێبناسی خەزنکراو بۆ پۆلێنکردن و رێکخستنی کەرستەکانی خۆی کەڵك وەردەگرێ، بەڵام لەوەتی کە خەرجی ئابونما و واسڵ بوونی راستەوخۆ بەم سەنتەرە زۆر قورس و گرانە زۆربەی کتێبخانەکان وایان پێ باشترە لە سەنتەرەکانی سەر CD-RAM کەڵکوەگرن کە هەم هەرزانترە و هەم کارکردیان ئاسانترە.

★ **پێکهاتەی پێشینەی مارك:**

زانیارییەکانی سەر کارتی پێرست ناکرێت بەهەمان شێوە بیانخەینە نێو کۆمپیوتەرەوە و پێرستی کۆمپیوتەری دروستبکەین. کۆمپیوتەر پێویستی بە فۆرمات (Format) یا چوارچێوەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە تا بتوانێ ئەو زانیارییانەی کە لەسەر پێشینەکانی کتێبناسیدان بخوێنێتەوە و تەفسیریان بکات. پێشین کۆمپیوتەری لە راستیدا چوارچێوەیەکە بۆ تۆمارکردنی زانیارییەکانی پۆلێنکردن و ئەوەی کە پاشان کەڵکیان لێ وەربگیردرێت بۆ گۆڕینەوە، گەڕان، دۆزینەوە، پیشاندانی زانیارییەکانی کتێبناسی، یا چاپی کارتەکانی پێرست.

فیلد (Field). هەر پێشینە یا ریکۆردێك بریتییە لە کۆمەڵێك لە زانیارییەکانی کتێبناسی (وەك ناوی بەرهەمهێنەر، ناونیشان، شیکردنەوەی بەرهەمهێنەر...)،

هەروەها زانیارییەکانی غەیرە کتێبناسی (وەك ڕێکەوتی پێکهێنانی ریکۆرد، ئەو ڕێسایانەی کە کەڵکیان لێ وەردەگیردرێت، ناوی پۆلێنکەر،...) کە هەریەك لەم زانیارییانە یا کۆمەڵێك لە چەند زانیاری هاوشێوە بەشێك دروستدەکەن بە ناوی فیلد، وەك بەشی بەرهەمهێنەر، بەشی ناونیشان و شەرحی نووسەر، شوێنی بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوە، هەر شوێنێك لەگەڵ نیشانەی یا هێمای تایبەت (وشە یا ژمارە) دیاریدەکرێت کە ئەو هێمایە پیشاندەری ناوەرۆکی ئەو فیلدە بۆ کۆکردنەوە لە کۆمپیوتەردایە.

زۆربەی فیلدەکان دەبێ لە رووی پانتایی و ژمارەی کارێکتەرەکان (Characters) پیتەکانی ئەلف و بێ کراوەبن لەبەر ئەوەی ڕێژەی زانیارییەکانی ئەوانە لە پێشینەیەکەوە بۆ پێشینەیەکیتر جیاوازە، وەك ناونیشان کە لە هەر بەرهەمێکدا نسبەت بە بەرهەمێکی دیکە لەوانەیە کورتتر یا درێژتربێت. بەم هۆیەوە، زۆربەی فیلدەکان دەگۆڕدرێن و هەندێك (وەك ژمارەی ڕێنما، ژمارەی کۆنترۆڵ و ژمارەی تایبەت بە کتێبخانە) سابت و بەردەوامن (Fixed Fields). هەروەها ڕێژەی فیلدەکان لەوانەیە کە لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازبێت، وەك ئەو کە هەندێك لە بەرهەمەکان زنجیرەیان هەیە و هەندێکی دیکەش نییانە، یا هەندێك لە ئامێر و کەرەستەکان وەك دەنگ و رەنگ یا ئەلیکترۆنی، لەوانەیە کە زانیارییەکانی باسیاری زۆرتریان هەبێت بەنسبەت مەودا و کەرستەکانی دیکە. لەم رووەوە، لە رووی پێکهاتییەوە، هەم درێژایی پێشینە و هەم شوێنی دەستپێکردنی هەر فیلد لە پێشینەیەکەوە بۆ پێشینەیەکی دیکە جیاوازن.

بۆ نموونە، هەمیشە شوێنی ناونیشان لە شوێنی ٥٣ دەست پێ ناکات، لەبەر ئەوەی کە زانیارییەکانی ناوچەیی پێش لەوە، واتا ناوی بەرهەمهێنەر (سەر شوناسە) لەوانەیە جیاواز بێت. لەم رووەوە، لە سەرەتا هەر پێشینەیەکی مارك، جێگای هەر فیلدێك (شوێنی دەستپێکردن و کۆتایی) دیاریدەکرێت.



ئەم پێکهاتەیە، واتا دیاریکردنی هێما بۆ هەر فیلدێك، دابینکردنی شوێنی دەستپێکردن و کۆتایی هەر فیلدێك، خاڵبەندی و ئەو نیشانانەی کە دەبێ بەرامبەر بە ڕێسایی ISBD لە پێشینەدابێن، ڕێگا بە کۆمپیوتەر دەدات تا چێوە و ئەو فۆرماتەی کە بۆ پیشاندانی زانیارییەکانی کتێبناسی مەبەستە (وەك ئەو کارتانەی پێرستی کە بە کۆمپیوتەر چاپکراون یا پیشاندانی زانیارییەکان لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر) پێکبێنێ.

جێگای ئاماژەپێکردنە کە هەر پرۆگرامێکی کتێبخانە نە دەتوانێ لە کاتی دروستبوون و بەرهەمهێنانی کارتەکانی پێرست چاپی، یا پیشاندانی زانیارییەکانی کتێبناسی، لە جێگای هێماکانی مارك لە هێمایێکی سادەتر وەك ((نووسەر))، ((ناونیشان)) کەڵکوەرگرێت، یا دەتوانێ زانیارییەکانی کتێبناسی بەبێ هێما و بەشێوەی کارتی پێرستی ئاسایی پیشانبدات.

گرووپەکانی کلی (Blocks) فیلدەکان لە مارکی ئەمریکا بەم شێوەی خوارەوەیە:

xx٠ زانیارییەکانی کۆنترۆڵی، ژمارەی ڕێنما و ژمارەکانی دیکە.
xx١ سەر شوناسەکان
xx٢ ناونیشانەکان و شەرحی بەرهەمهێنەران، پێداچوونەوە و بارودۆخی چاپ و بڵاکردنەوەی
xx٣ باسیاری فیزیکی
xx٤ زنجیرەکان
xx٥ یادداشتەکان
xx٦ شوناسەکانی بابەتی
xx٧ شوناسە زیادکراوەکانی دیکە
xx٨ شوناسەکانی زیادکراوی زنجیرە
xx٩ لەبەرچاوگیراو بۆ زانیارییەکانی خودی کتێبخانە

هاوكات دەبێ سەرنج بدەین كە هەریەك لە گرووپەكانی كلی خۆیان دابەشكردنی بە چەندین فیلدی جۆراوجۆر، وەك دەستەی xx١ (سەرشوناسە) كە ئەو فیلدانەی جۆراوجۆری خوارەوە لەخۆ دەگرێت.

١٠٠ سەرشوناسەی كەسان ١١٠ سەرشوناسەی تنالگانی ١١١ سەرشوناسەی كۆنگرەكان ١٣٠ سەرشوناسەكانی ناوونیشانە رێكەوتنەكان ١٤٠ سەرشوناسەی ناوونیشان لە ماركی ئەمریكی، ئەو هێما و فیلدانەی كە زۆرتر كەڵكیان لێوەرگیردراوە برتین لە:

٠١٠ ژمارەی كۆنترۆڵی كتێبخانەی كۆنگرە
٠٩٠ ژمارەی ستانداردی نێو دەوڵەتی كتێب (ISBN)
٠٥٠ ژمارەی رێنمای كۆنگرە
١٠٠ سەرشوناسە — ناوی شەخس
٢٥٤ ناوونیشان، زانیارییەكانی دیكەی ناوونیشان و شەرحی بەرهەمهێنەر
٢٥٠ شەرحی پێداچوونەوە
٢٦٠ بارودۆخی چاپ و بڵاوكردنەوە
٣٠٠ چۆنیەتی فیزیكی
٤٤٠ شەرحی زنجیرە
٥٢٠ یادداشتی كورتەی بەرهەم
٦٥٠ شوناسەی بابەتی
٧٠٠ شوناسەی زیادكراوی كەسان (وەك نووسەری هاوكار، وەرگێڕ، پێداچوونەوە)

خاڵێكی دیكە كە دەبێ ئاماژەی پێ بكرێت ئەوەیە كە هەندێك لە فیلدەكان دووپات دەبنەوە Repeatable Fields، وەك شوناسەكانی بابەتی و شوناسە زیادكراوەكان كە سەبارەت بە زۆربەی بەرهەمەكان زیاتر لە یەك دانەن.

ئەوەی كە لە خەزنكردن (Save) و دۆزینەوەی زانیارییەكان گرنگە، ئەوەیە كە فیلدەكان و ئەو زانیارییانەی كە پێویستە بدۆزینەوە، پێشتر دیارییان بكەین و ئەوانە



لەو فایلەدا كە مەبەستمانە پێرستیان بكەین. ئەم جۆرە فیلدانە و فیلدەكانی غەیرە سەرەكی دەدۆزێنەوە، وەك سەرشوناسەكان، ناوونیشان، بابەت و شوناسەكانی زیادكراو.

**★ پێكهاتەی فیلدەكان:**

لە پێشینەیەكی كتێبناسیدا، زۆربەی فلیدەكان چەندین فیلدی غەیرە سەرەكیان هەیە بە مەبەستی دەست پێوەگرتن لە شوێنی خەزنی كۆمپیوتەر، بەجێی ناوی تەواو لەهەر شوێنێك لە نیشانەكانی پیت یا ژمارە و بەجێی شوێنە غەیرە سەرەكییەكان لە نیشانەگەلێكی تایبەتی كەڵكوەرگرین.

بۆ نموونە، لە ماركی ئەمریكی ((USMARC)، "٢٦٠" بەجێی ((شوێنی بارودۆخی چاپ)) و "$ a" بەجێی ((شوێنی چاپ و بڵاوكردنەوە)) و "$ b" بەجێی ((ناوی دەزگا)) "$ c" بەجێی ((ساڵی چاپ و بڵاوكردنەوە بەكاردێت)).

نیشانەكانی یەك پیتی a, b, c و هتد رەمزی فیلدەكانی غەیرە سەرەكیان پێ دەگوترێت.

وەك

٢٦٠ ٠$a New York: $ b Academic press $ c ١٩٩٨

**★ نیشاندەرەكان و ئەو هێمایانەی كە لە نێواندا هەیە:**

پاش لە شوناسەی هێمای هەر شوێنێك، دوو كارەكتەر كە نیشاندەر (Indicator) یا رێنمایی پێدەڵێن تۆمار دەكرێت. هەریەك لەم دوو ئامێرانە، كارێكی تایبەت دەكەن: یەكەمیان نیشاندەری ئەوەیە كە ئایا پێویستە ئەو فیلدەی كە مەبەستمانە پێرست بكرێت و لە ناوەرۆكەكەی شوناسەیەكی زیادكراوی بۆ دروستبكەین یا نە؟ ژمارەی ((١)) واتا پێویستە كە لە فایلی پەیوەستدا پێرست بكرێت و ژمارەی ((سفر)) واتا پێویست نییە.

سەبارەت بە شوناسەکانی بابەتی، بەتایبەت نیشانەی ((-)) تەقەڵ واتا پێویستە کە پێرست بکرێت.

لە فیلدی ناوونیشان دووهەمین نیشاندەر دەرخەری ئەوەیە کە دیاریبکات ناوەرۆکی فلید لەسەر بنچینەی چەندەمین پیت دەبێ ئەلف و بێ بکرێت. بۆ نموونە، پیتێك وەك An, A, The لە زمانی ئینگلیزی و ((ال)) لە زمانی عەرەبی لە کاتی ئەلف و بێ کردندا حسێب ناکرێن.

**نموونە:**

٢٤٥١٤ $ a The library mangement hand book / $ c by james Carter and John Smith.

٢١٢٤٥ $ أ الميزان فی تفسير القران / $ ج محمد الحسين الطباطبائي

لە نموونەی سەرەوە، "٢٤٥" پیشاندەری فیلدی ناوونیشان و شەرحی بەرهەمهێنەر، نیشاندەری ((١)) دەرخەری ئەوەیە کە پێویستە بە ئیندێکس کردنی ناوونیشان لە پێرست، نیشاندەری ((٤)) دەرخەری ئەوەیە کە ٤ کارکتەر یەکەم (سێ کارکتەر بۆ وشەی the و یەك کارکتەر بۆ شوێنی بۆشایی پاش ئەوانەیە). نیشانەی $ a بۆ ناوونیشان و نیشانەی $ c بۆ شەرحی بەرهەمهێنەر بەکاردێت ئەگەر پاش لە هێمای فیلدێك، نیشانەی تەقەڵ ((-)) هاتبێت واتا کە ناوەڕۆکی فیلد پێویستی بە ناساندن و دابینکردنی شوناسە نییە.

بۆ نموونە: شوێنی بارودۆخی چاپ و بڵاوکردنەوەی یەکێك لەم فیلدانە لە خوارەوەیە:

٣٠٠ -- $ م ٢١٨ ل. $ ب وێنەدار، $ ج ٢٢ س م.

بۆ دیاریکردنی کۆتایی هەر فایلێکی غەیرە سەرەکی لە نیشانەی # یا I کەڵك وەردەگرین. ئەم نیشانەیە کە Delimiterی پێدەڵێن، لە هەندێك لە پرۆگرامەکانی پۆلێنکردندا جیاوازە. نیشانەی ئاسایی دیکە بریتین لە: a، $، و -، و ٪.



هەروەها لە کۆتایی هەر شوێنێك یەك دانە Delimiter دادەنرێت (وەك نیشانەی ٩١) کە شوێنێك لە شوێنی دوایی جیادەکاتەوە. لە کۆتایی هەر پێشینەیەکیشدا یەك دانە نیشانەی Delimiter دادەنرێت. لە زۆربەی فۆرمەکانی مارکدا، زانیارییەکانی زۆرچڕ و پڕتر نسبەت بەوەی کە لە سەرەوەی ئاماژەی پێکرا. هەیە. هەر پێشینەیەکی مارکی پێکهاتەیەکی دوور و درێژی هەیە، کە زانینی ئەوانە بە مومارسە و کارکردن ئاسان دەبێت.

هاوکات هەر یەك لە مارکەکان دەستوورنامەیەکی چڕ و پڕ بۆ بەکارهێنانیان و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی دەخاتە بەردەست کتێبخانەکانەوە.

**★ یونی مارك:**

یەکەمین پێداچوونەوەی یونی مارك لە ساڵی ١٩٧٧ و دووهەمین پێداچوونەوە لە ساڵی ١٩٨٠ چاپ و بڵاوکرایەوە. لەو کاتە بەم لاوە پێداچوونەوەی نوێتر دەکەوێتە بەردەست کە دوایین پێداچوونەوەی مارچ لە ساڵی ٢٠٠٠ دایە. ئیفلا بەرپرسی پشتیوانی و پێداچوونەوەی یونی مارك.

یونی مارك بەرهەمی هاوبەشی نوێنەرانی رێکخراوەکان و پۆلێنکەرانی چەندین وڵاتە کە هەوڵیاندا چوارچێوەیەك پێکبێنن کە گونجاوتربێت لەگەڵ پێداویستەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر لە پاشەکەوت کردن و گۆڕینەوەی زانیارییەکانی کتێبناسی.

یونی مارك هەموو چەشنەکانی مەواد و کەرستەکانی کتێبخانەی لەبەرچاو و لە رێساکانی نیشاندانی ستاندار (ISBD) کەڵك وەردەگرێت.

بەتێکڕا یونی مارك بەرژەوەندی و تایبەتمەندی زۆر وەك بەردەوام بوونی پێکهاتە پیشاندانی باشتری پێوەندییەکانی کتێبناسی، پەیوەست نەبوون بە رێساکانی پۆلێنکردنی تایبەت و هتد هەیە.

**★ پرۆگرامی شیاو بۆ پۆلێنکردن:**

کتێبخانەکان بۆ کەلکوەرگرتن لە کۆمپیوتەر لە پۆلێنکردندا سەرەتا بە پرۆگرام واتا بەرنامەیەکی پێویست بۆ واریدکردن، خەزنکردن و دۆزینەوەی زانیارییەکان پێویستیان هەیە. ئەو پرۆگرامەی کە بۆ کتێبخانە لەبەرچاو گیراوە کە لە لایەن بەرنامەنووسانی کۆمپیوتەری و بەهاوکاری راستەوخۆی کارگێڕانی کتێبخانە ئامادە و دروستدەکرێت. دەبێ تایبەتمەندگەلێکی ئەو تۆی هەبێت. تا ئێستا پرۆگرامی جۆراوجۆر لە لایەن کتێبخانەکان و دامەزراوەکانی میللی یا نێودەوڵەتی، یا بەشی تایبەت ئامادە و دروستکراون. ئەم پرۆگرامانە کەم کەمە بە درێژایی ساڵەها کەلکیان لێوەرگیراوە، تەواوتربوون و بەتواناتربوون.

بەتێکڕا هەر پرۆگرامێك دەبێ بە شێوەیەك بێت کە کارگێڕانی کتێبخانە بتوانی ئەو زانیارییانەی کە مەبەستیانە، وەك زانیارییەکانی کتێبناسی ئەو کتێبانەی کە پێرست کراون بە ئاسانی و لە ڕێگای کیبوردەوە یا ئەو زانیارییانەی کە لەسەر CD-RAM هەیە بیخەینە نیو کۆمپیوتەر و لە نیهایەتدا خوێنەران بتوانن بە ئاسانی بەفێربوونێکی کەم زانیارییەکانی کە پێویستیانە لە ڕێگای کومپیوتەرەوە دەستبخەن یا بدۆزنەوە.

پرۆگرامە نوێیەکان نە تەنها زانیارییەکان کە پەیوەست بە کتێبە پێرست کراوەکانی، بەڵکو زانیاری ئەو کتێبانەی کە بە ئەمانەت برداراون و تەنانەت ئەو کتێبانەی کە بڕیارە کە بکڕدرێن بە پێوەندی گرتن لەگەڵ بەشی ئەمانەت یان کڕین پیشاندەدات.

لە پرۆگرامەکانی کتێبخانە گەورەکاندا ئەو دەرفەتە هەیە، کە لە ڕێگای هێڵەکانی پێوەندی گرتنەوە زانیارییەکانی کتێبی کتێبخانەکانی دیکەی ئەندام چ لە یەك تۆڕی ناوچەیی Local Area Network و چ لە تۆڕێکی بەربلاوتر Wide Area Network بەدەستبێنین.



بۆ فێربوونی شێوەی کاری پرۆگرامەکانی کتێبخانە و پۆلێنکردنی کۆمپیوتەری ئیمکاناتی جۆراوجۆر بە شێوەی بەرنامەی فێرکردن و راهێنان دروستکراوە کە بە چێوەی ئەلیکترۆنی (CD-RAM)، هەروەها فایلی ئەلیکترونی و ئینەترنێت) لەبەردەستدایە. یەکێك لە بەناوبانگترینی ئەو پروگرامانە Catskill کە پۆلێنکردن لە کۆمپیوتەر، بەتایبەت هێنانی زانیاری لە فۆرمەت مارك بە شێوەی تەعامولی فێردەکات. یەکێکیتر لەم پرۆگرامانە Mitinet کە بەرنامەی فێرکردنی بە شێوەیەکی زۆر سادە چۆنیەتی هێنانی زانیارییەکانی کتێبناسی لە پێرست، هەروەها چۆنیەتی پێکهێنان و دروستکردنی پێرست نیشاندەدات.

ئێستا زۆربەی پرۆگرامەکان بە شێوەیەك دروستدەکرێن کە لەوانە بکرێت لە ویب (www) کەڵك وەربگیردرێت. بەو پێرستانەی کە لەم جۆرە پرۆگرامانە کەڵك وەردەگرن. پێرستەکانی ویب – پایە Web Based Catalogs پێ دەگوترێت کە لە هەر شوێنێکی جیهان دەستدەکەوت. سەرەڕای ئەوەش، لەم پێرستانەدا لە ئیمکاناتی دیکە بۆ پێکهێنانی پێوەندی لە نێوان پێشینەکانی پێوەندیدار یا بەرهەمەکانی یەك نووسەر، یا بابەتەکانی هاوشێوە کەڵك وەردەگیردرێت.

پرۆگرامە نوێیەکان بەردەوام لە حاڵی گۆڕانکاریدان و تەواوتر دەبن هەر بۆیە ئیمکاناتی لە رادەبەدەر دەخەنە بەردەست پشکێنەرانی زانیارییەوە.

لێرەدا چەندین نموونە لە هەندێك لە بەشەکانی پرۆگرامی کتێبخانە، هەروەها CD-RAM کتێبناسی میللی ئێران و مارکی کۆنگرە (CD-MARC) پیشاندەدرێت.

ئەدرەسی هەندێك لە سایتەکان و سەرچاوەکانی پۆلێنکردن لە ویب:

١- Internet Library for Librarians

(www.Hcompany.com/inforetrieral/cat.htm)

٢- The Library of congress cataloging

)lc web.loc.gov/catdiv/cpso.html(

٣- Technical Services unlinited

(tpot.ucsd.edu/T٥U)

Information for the Library perofession

(www.dpi.state.wi.vs/dltcypld/pro-info.htm#techical)